The first Magazin Especializined in Management and Human Development in Kurdistan

# بڕیار

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
ساڵی دووەم – ژمارە 24 – ئایاری 2010

بەڕێوەبەری نووسین
**بەرزان ئەبوبەکر**

سکرتێری نووسین
**ئەسکەندەر رەحیم**

ب: پەیوەندییەکان
**محەمەد هاشم محەمەد**

دەستەی نووسەران
**هاژە شێروانی** **پەیمان بەرزنجی**
**بێگەرد فارس** **پەری شێخ کەریم**
**وەهاب حەسیب** **محەمەد مێرگەیی**

راوێژکاری یاسایی
**پارێزەر: ئازاد محێدین**

دیزاین
**جەمال دەروێش**
**پشتیوان عەبدولڕەحمان**

بەشی ڕیکلام
07480112787

حساب بانکی گۆڤار
بانکی کوردستانی نێودەوڵەتی سلێمانی 3371

خاوەنی ئیمتیاز
**ئەندازیار مەسعود تاهیر ڕۆژبەیانی**

سەرنووسەر
**عادل محەمەد شێخانی**
sarnosar@yahoo.com


بۆ دابەشکردنی بڕیار

هەولێر: خانەی سیروان ٠٧٥٠٤٦٧٢٩٦٣
کەرکوک: ٠٧٧٠٨٥٦٣٧٢٤ هەڵەبجە: ٠٧٧٠١٩٣٣٩٦٧ -٠٧٥٠١١٢٩٤٢٧ دەربەندیخان:
٠٧٧٠١٥٨١٠١٨ کفری: ٠٧٧٠١٥٦٦٨٧٦ کەلار: ٠٧٧٠٢١٠١٢٨٨
چەمچەماڵ: ٠٧٧٠٨٥٥٠٥٨٦ کۆیە: ٠٧٧٠١٥٤٩٧١٤ سۆران: ٠٧٥٠٤٥٠١٩٣٣
چۆمان: ٠٧٥٠٤٥٦٧٩٩٢ قەڵادزێ: ٠٧٧٠١٥٨٥٢٠١ ڕانیە: ٠٧٧٠١٥٨٠٤٤٢

ناونیشانی گۆڤار

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری سلێمانی مۆڵ- نهۆمی دووەم
بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردە
٣١٩٣٩٤٦ ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢
E-mail: bryarmagazin@gmail.com
هەولێر ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

تیراژ: 3000 دانە

چاپخانەی سەردەم

کەس تاوانبار مەکە

گومانی خراپ بە کەس مەبە

تەنها ڕەخنەگر مەبە

خێراکە بجوڵێو

کارێکی جیاواز دەست پێ بکە!!

یەکەم دڵۆپ

# بڕیار.... بڕیارێکی مێژوویی بۆ ژیانێکی نوێ!

## سەرنووسەر

دوو ساڵ لەمەوبەرو لە کۆتا ڕۆژەکانی بەهاردا گۆڤاری بڕیار هاتە نێو دنیای ڕاگەیاندنو لە لوتکەیەکی بەرزو سەنگینداو بە هێمنی لە نێو جیهانێکی جەنجاڵدا توانی لە ماوەی تەمەنێکی کورتی شکۆداردا وێڕای ئەوەی کە تاجی یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی لەسەر نا، توانی بۆشاییەکی گەورە لە دنیای ڕۆژنامەوانی کوردیدا پڕ بکاتەوە.

بڕیار... هیممەتو بەرخودانێکی نوێ بوو، جارێکی تر هیوای بە دڵەکان بەخشیو خەندەی خستەوە سەر لێوانو گوڕوتینێکی نوێی بەخشی بە شەیدایانی ژیانو گەشەپێدانو سەرکەوتن، بەرەو لوتکەی پێشکەوتن.

لە بڕیاردا جارێکی تر تاکی کورد دەستلەملانی هیواو خۆزگەکانی دەبێتو فەزایەکی فراوان بۆ خۆشەویستیو برایەتیو پێکەوە ژیان بەدی دەکات.

لە بڕیاردا مرۆڤەکان جیهانێکی ڕەنگاوڕەنگ دەبینو دەزانن کە دنیا تەنها لە دوو ڕەنگی ڕەشو سپی پێك نەهاتووە!

لە بڕیاردا مرۆڤەکان متمانە بە خۆیان پەیدا دەکەنو هەست دەکەن کە دەکرێت ئەوان بەشێك لە چارەسەر بن، یاخود بتوانن بڕیاری چارەسەری یەکجارەکیش بدەن، نەك وەکو جاران تەنها خۆیان بە بەشێك لە گرفتەکان بزانن.

بڕیار هەوارێکی هەمیشە بەهاری دڵەکانەو بە وتەی جوانو دەستی نەرمو هەستی گەرمەوە دەستی خوێنەرانی دەگرێتو داوای بە خۆداچوونەوەو بەرنامەڕێژیو نۆژەنکردنیان لێ دەکات...

دووساڵ لە تەمەنی پڕشکۆی بڕیار تێپەڕی، دوو ساڵ لە هەوڵو تێکۆشانو شەونخوونیو هەوڵو تەقەلای بێ وچان.

لە ماوەی ئەم دوو ساڵەدا سەربازانی ونو ستافی کارای ئەم گۆڤارە ڕەنگینە، بە بێدەنگیو بێ چاوەڕوانی هیچ پاداشتو پیاهەڵدانێك وەکو ئەرکێکی نەتەوەیی لەم کارە پیرۆزەدا دریغییان نەکردو ئەوپەڕی چالاکیو گەورەییان نواند.

ئەمڕۆش کە بێدەنگیو هێمنیو دوور لە چاوی کامێراو کەناڵەکانی ڕاگەیاندنو شاباشی سوڵتانو چەپڵەڕێزان ئەم یادە دەکەنەوە، لە ناخی دڵمەوەو بە ناوی هەموو خوێنەرانو دۆستانی بڕیارەوە پیرۆزباییتان لێ دەکەمو دەستی ماندووبوونتان دەگوشمو دڵنیاتان دەکەم کە فیستیڤاڵی پیرۆزباییو دەستخۆشی ئێوە لە نێو دڵە سپیو پرشنگدارەکاندا سازدەکرێتو هەمیشە لە نێو سۆمای چاوە گەشەکاندا دەژین.

بەرەوکۆمەڵگەیەکی خاوەن بڕیار... ئومێدی بەردەوامیو سەرکەوتنتان بۆ دەخوازم.

# كارگێڕی به گوفتار

زانیاری ڕاســتەقینە ئەوەیە کە بزانیتو بگۆڕییت، چونکە تەنها نەزانەکانن کە هەر چەندە بزانن بەڵام هەرگیز ناگۆڕێن.

«جۆستاف لۆبۆن»

ئەو کەسەی چارەسەری نوێ پیادە ناکات، دەبێت چاوەڕوانی بەڵاو گرفتی نوێ بکات.

«برایان ترەیسی»

ئەگەر دەتەوێت ئەنجامی جیاوازت دەستکەوێت، پێویستە کردارەکانت بگۆڕیت.

«پەندێکی چینی»

کارە گەورەکان، کاری بچکۆلە بوون، بەڵام بەردەوام بوونیان پێ بەخشرا.

«کریستۆفەر مۆرلی»

دەستپێکردنی باش، کۆتایی باشی دەبێت.

«پەندێکی ئینگلیزی»

بیربکەرەوە وەکو داناکان، بەڵام قسە بکە وەکو مرۆڤە ئاساییەکان.

«ئەرستو»

# کارگێڕی بە چیرۆك

## ئەی شیرەکە کوا؟

گەورەی هۆزێك بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەژاریو برسێتیو نەبوونی لە گوندەکەیاندا داوای لە هەموو ئەندامانی هۆزەکەی کرد، کە هەر یەکەیان پەرداخێك شیر بهێنێتو بیکاتە نێو ئەو دەفرەی کە لە نێوەڕاستی ئاواییەکەدا دایدەنێتو داواشی لێکردن کە ئەم کارە لە شەودا ئەنجام بدەنو هەوڵبدەن کەس چاوی لەو کارە نەبێت، ئەمانیش لە شەوداو بە دزی یەکترەوە هەر کەسەو پەرداخی خۆی کردە نێو دەفرە گەورەکەی نێوەندی گوندەوە.

بۆ سبەینێ سەرۆکی هۆز کاتێك تەماشای کرد بینی، کەوا دەفرەکە لە بری شیر پڕە لە ئاو!!

سەری لەم کارە سوڕماو بەسەر سوڕمانەوە پرسی: ئەی شیرەکە کوا؟

بۆچی ڕەعیەت لە بری شیر دەفرەکەیان بە ئاو بۆ پڕ کردەوە!؟

دواتر بۆی دەرکەوت کە هەموویان لەسەر یەك ڕا ڕێکەوتبوون لە هزری خۆیاندا.

هەر یەکێك لەوان وەها بیری کردبۆوە کە پەرداخە شیرەکەی ئەو لە نێو پەرداخەکانی ئەواندا ون دەبێتو کەس هەست بە پە رداخە شیرەکەی ئەو ناکات، ئیتر چی پێویست دەکات پەرداخێك شیر بە زایە بدات!

بە داخەوە هەموویان بە یەك شێوە بیریان کردبۆوەو بە هیوای ئەوە بوون پەرداخە ئاوەکەیان لە نێو پەرداخە شیرەکاندا ون دەبێت، لە ئەنجامدا نەیانتوانی کۆمەکی یەکتر بکەنو گوندەکەیان لە هەژاریو برسێتی ڕزگار بکەنو لە دوایشدا کەسانێك لە برسا مردنو کەس نەبوو لە کاتی تەنگانەدا فریایان بکەوێت!

**لەم چیرۆکەوە چی فێر دەبین:**

١- ژیان بەخشینەو تەنها وەرگرتنو سوود وەرگرتن نییە، مرۆڤ نابێت تەنها بەرژەوەندی خۆی لێك بداتەوە.

٢- بەڕێوەبردنی بەرژەوەندییە هاوبەشەکان پێویستی بە هاریکاری هەموو لایەك هەیەو نابێت هەر کەسەو چاوەڕوانی کەسانی تر بکاتو خۆی لێ بدزێتەوە.

٣- بیرکردنەوەی خراپ تاکی خراپو کۆمەڵگای خراپو نێگەتیف بەرهەم دێنێت.

٤- خۆپەرستیو ڕژدی شەرمەزاریو پەشیمانی لە دوایە.

٥- مرۆڤ نابێت خۆی بە لاوە بچووك بێت، پەرداخێك شیر بەس بوو بۆئەوەی کە هەر یەکێك لەو هۆزە ناوازەییو جیاوازی خۆی بنوێنێتو بیسەلمێنێت کە مرۆڤێکی پۆزەتیڤو چاکخوازە.

٦- ژیان بە هاوکاریو کاری خێرخوازیو میهرو بەزەییەوە خۆشەو کۆمەڵگا بەو کارە تەباو خۆشەویستو یەکڕیز دەبێت.

٧- با هەمیشە بیر لەوە بکەینەوە کە کاری باش بکەینو هەموو خەڵکی بیزانن و نموونەی چاکە بین، نەك خراپەو گزی بکەینو هەوڵبدەین لە خراپەی کەسانی تردا بیشارینەوە.

# سەرەتایەك لە زانستی ڕێكخستن

هاژە شێروانی

چوارەم/ پەیكەربەندی كەرتی گەورە (كەرتەكان): **Divisional Structure**

ئەم جۆرە پەیكەربەندە لە واقیعدا دەردەكەوێت لە شێوەی كۆمپانیاكانی (قابضە)و ئەوەی كە پەیڕەوی دەكات لە كۆمپانیا پەیڕەوەكان، ئەو مەڵبەندە سەرەكییەی كە كارگەكان یان لقە سەربەخۆكانی پەیڕەوی دەكەن یان گروپی خێزانین كە كۆمپانیاكانی پەیڕەوكراو پەیڕەوی دەكات بۆ هەمان گروپی یەك خێزانی.

ئەم جۆرە پەیكەربەندەش سەرهەڵدەدات كاتێك كە كارەكانی كۆمپانیاكان فراوان دەبن لە قەبارەیاندا، بە شێوەیەكی سروشتی خۆی دابەش دەكاتە سەر كۆمەڵێك كۆمپانیای لقدار، هەر لقێك سەربەخۆیی خۆی هەیە لەگەڵ پارێزگاری كردن لە كۆمپانیای دایك (شركە الام/ القابضە) كە هەموو سەرمایەو پشكەكانی هەیە بە هەماهەنگی بە شێوەیەك یان هی تر لە نێوان كۆمپانیا پەیڕەوەكانی، كۆمپانیاكانی ئۆتۆمبێلو خۆراكی جیهانی باشترین نموونەن بۆ ئەم جۆرە پەیكەربەندە یان هەرەمەی كەرتی، بە جۆرێك كە كۆمپانیای سەرەكی دوور لە لایەنەكانی تری بە گوێرەی ژمارەی بەرهەمەكانی، یان شوێنی بەرهەمهێنان، یان بازاڕە جوگرافییە جیاوازەكان ئەوەی كە هانی كۆمپانیای سەرەكی دەدات لەسەر دروستكردنی كۆمپانیاكانی پەیڕەوی كە هەر كۆمپانیایەك ڕێككراوە لە سەربەخۆیی سەرمایەو سەرچاوەو پرۆسەكانی بەرهەمداریو بەكارخستنو بەرهەمەكانو دەركردەكانی، هەر بۆیە دەتوانین كە لێپێچینەوە لەگەڵ بەڕێوەبەران بكەین لەسەر توانایان لە بەكارخستنی سەرچاوەكانیان بۆ دەستەبەركردنی دەرەنجامی باشو لەوانەیە كە ڕێكخستن یان پەیكەربەندی كەرتی نەگاتە ڕادەی كۆمپانیای قابضەو كۆمپانیاكانی پەیڕەوكراو، بەڵكو لەوانەیە كە كۆمپانیای قەبارە گەورە خۆی دابەش بكاتە سەر كەرتی سەربەخۆ لە یەكتری، بۆ نموونە كەرتی بەرهەمهێنان كەرتێكی سەربەخۆیەو تەحەكوم بە سەرچاوەكانی دەكاتو كەرەستەكانی بەكاردێنێ لەگەڵ كرێكارەكانیو سەرمایەكانی بۆ خستنەڕووی بەرهەمەكانی بە تەواویو فرۆشتنی بۆ كەرتێكی تر كە كەرتی بە بازاڕخستنە ئەمیشیان كەرتێكە پەیكەرێكی سەربەخۆی هەیە لە سەرچاوەكانی كە بانگەشە دەكات بۆ بەرهەمەكانیو نرخەكانیو دابەشكردنی بەو جۆرەی كە دەبینێت گونجاوە بۆی، لەوانەیە بگاتە كەرتی سەرچاوەی مرۆییو كەرتی دارایی كە كەرتی سەربەخۆنو خزمەتەكانیان دەفرۆشێت بە سەرچاوەی مرۆیی، لە داراییو ژمێریاریو شیكردنەوەی دارایی بۆ هەریەك لە كەرتەكانی بەرهەمهێنانو بە بازاڕخستن، كەواتە سیمای زاڵ لە ڕێكخستنی كەرتی بریتییە لە بوونی هەرەمی سەربەخۆ، كە هەر هەرەمێكی سەربەخۆ وادادەنێن كە سەربەخۆیە لە لایەنی سەرچاوەی تایبەت بە (داراییو مرۆیی) كە پرۆسەكانی سەربەخۆن، تەحەكوم دەكات بە بەرهەمەكانیو دەرخستە كۆتاییەكانی، هەر لەبەرئەوەیە كە دەتوانێت سەرزەنشتی بەڕێوەبەرەكان بكات لە بەكارهێنانو بەكارخستنی سەرچاوەكانی بەردەستیان.

ئا بەم شێوەیە پەرەپێدانو پێشكەوتنی زانستی سەردەمیانە ڕوویاندا لە پەیكەربەندی كەرتەكانی، كە ئاماژە دەكات بۆ سەرهەڵدانی گەلێك جۆر لە پەیكەربەندی/ هەرەمی كەرتی كە ئەمانەن:

١- لەسەر بنەمای بازاڕ (یان كڕیارەكان): ئەم جۆرە پەیكەربەندانە كەرتەكان (كۆمپانیا پەیڕەوەكان) ڕێكدەخرێن بە گوێرەی بازاڕەكان، یان لە سەر بنەمای كەرتی بە بازاڕخستن یان كڕیار، بازاڕیش ئەو مەنتیقەی كە تەحەكومی ڕێكخستنی كۆمپانیای دایك (قابضە) یان مەڵبەندی سەرەكی یان كارگێڕی باڵا دەكات.

٢- لە سەر بنەمای جوگرافی: لەم جۆرە پەیكەر بەندەدا پشت دەبەسترێت بە ناوچەی جوگرافی بۆ دابەشكردنی كۆمپانیا بۆ كەرتە جوگرافییەكانو بە گوێرەی بوونی شوێنی كارگەكان یان لقەكانی بەرهەمداریو پرۆسەكان، كاتێك كە لقەكانو كارگەكانی تایبەت بە پرۆسەكانو بەرهەمەكان بڵاودەبنەوە شێوەی دابەشكردنی كەرتی وەردەگرێت.

٣- لە سەر بنەمای كاڵا (بەرهەمەكان): لێرەدا بەرهەم توخمێكی گرنگە لە شێوەی كۆمپانیای دایكو بە ڕێگایەك دەتوانێت كە لە ڕێگایەوە سەربەخۆییەك بدات بە هەموو بەرهەمەكان، هەر بەرهەمێك سەربەخۆ دەبێت لە شێوەی كەرت یان كۆمپانیادا،

دابەش دەبێتە سەر سێ جۆر کە بریتین لە:

أ- پەیکەربەندی کاڵای سەرەکی: واتا هەر کەرتێك کاڵایەکی سەرەکی هەیە.

ب- پەیکەربەندی کاڵای دووبارەبووەوە: لێرەدا بەرهەمهێنانی ئۆتۆمبێلی جۆراوجۆر لە یەك (مارکە)دا.

ج- پەیکەربەندی کاڵای بە گروپی کار: پێکهێنانی گروپی کارکردن لە نێوان کەرتەکانو کۆمپانیای دایكو هەماهەنگی کردن لە نێوانیاندا.

هەرچی سەبارەت بە ناسینەوەو خەوشەکانی پەیکەربەندی کەرتییە کە بۆ هەموو جۆرەکانی دەبێتو ناسینەوەکانیشی بریتین لە:

١- ڕێکخراو توانای بەرزە لە سەر ڕێچکەی کارکردن لەگەڵ گۆڕانو ڕووبەڕووبونەوەی بارودۆخە گۆڕاوەکانی لە دەوروبەریدا.

٢- توانای بەرزە لەسەر پڕکردنەوەی پێداویستییە جیاوازەکانی کڕیار لە بازاڕو کەرتە جیاوازەکانی.

٣- توانای بەکارهێنانی ئامێرەکانی هەماهەنگی لە نێوان ئەو کەرتانەی کە پەیڕەوی کۆمپانیا دەکات.

٤- دەستەبەرکردنی ئاستێکی بەرز لە لامەرکەزییەت بۆ بەرژەوەندی ئەو کەرتانەی کە پەیڕەوی کۆمپانیا دەکات.

هەرچی خەوشەکانییەتی ئەمانەن:

١- پەرشوبڵاوبوونەوەی کەرتە جیاوازەکان زاڵ دەبێت بەسەر توانای دەستەبەرکردنی ئابوورییەکانی قەبارەی گەورە.

٢- ئاسان نابێت کە هەماهەنگیو تەواوکاری سەربەخۆ بکات لە نێوان کەرتەکانی.

٣- ئاستەم ڕێچکە کردنی سیستەمو سیاسەتو یاساو ڕێو شوێنەکان بۆ کەرتە سەربەخۆکان.

پێنجەم/ پەیکەربەندی مەبەستدار/ کاتی: Adhocracy Structure

ئەگەر هاتوو پەیکەر بەندەکانی بیرۆکراسی (میکانیکی یان پیشەیی) زۆر بەربڵاوتربوون لەم سەردەمەدا، دەبینین کە پەیکەربەندی نوێتر سەریان هەڵدا بۆ پێویستی بوونی ئەو بارانەی کە تیایدان یان سروشتی ئەو بارودۆخەی کە کاری تیادا دەکات، هەر بۆیە ئەم پەیکەربەندە نوێیانە لە دایکبووی بارێکن یان بارودۆخێکن، کە بە گۆڕانی ئەم بارودۆخە مەبەستی پەیکەرەکەی ون دەبێت، یان دەگۆڕێتە سەر شێوەیەکی تر، یان لەوانەیە ژیانی ڕێکخراوەکە لێرەدا کۆتایی پێبێتو بە کۆتایی هاتنی مەبەستەکەیان یان بارودۆخەکە، بەم جۆرانەش دەوترێت پەیکەربەندی مەبەستدار یان کاتی، کە بە نەرمو نیانییەکی بەرز دەناسرێتەوە لە مامەڵەکردنی لەگەڵ ژینگە گۆڕاوەکانو باروسروشتە تایبەتەکان، بە زۆریش لە ڕێکخراوە پسپۆرییەکان سەرهەڵدەداتو پێویستی بە کارزانی هونەری وردو بەرز هەیەو لەوانەیە پشت ببەستێت بە پێکهاتەی گروپەکانی کارکردنی پسپۆڕدارو پێویستی بە داهێنان دەبێت لەگەڵ پێدانی ئاستێکی بەرز لە سەربەستیو سەربەخۆیی بە گروپەکانیو پسپۆڕەکانی.

هەر بۆ نموونە: کۆمپانیاکانی بەڵێندەرایەتی عەقاری کە خانوو بینا دەکەن پێویستیان بە هەرەمێك هەیە لە پاڵ ئەم هەرەمەی ئێستایاندا لە هەر شوێنێك لە شوێنی بیناکردنو کارکردن، ئەم پەیکەرانەش کاتینو کۆتاییان دێت بە کۆتای هاتنی بیناسازی واتا مەبەستدارەو لەم کاتەدا دروستبووە کە مەبەستمان کاری بیناسازی بکەین، لەوانەیە یەکەکانی بیرۆکراسی گەورە وەکو کۆمپانیاکانی پیشەسازی گەورە پێویستی بە دروستکردنی یەکەکان یان مەڵبەندەکانی توێژینەوەو پەرەپێدان بێت، کە ئەرکەکەی داهێنانو پاڵاوتنی ئایدیاکانو پرۆژە نوێیەکانی کۆمپانیان، کە پێویست دەکات ئەم مەڵبەندانەی توێژینەوە سەربەخۆیو نەرمو نیانییەکەی بەرزیان پێ بدرێت، لەم شێوەی پەیکەربەندەشدا گەلێك جۆری تر بە دیاردەکەون، وەك پەیکەربەندی (ماتریکسی، یەکەکانی سەربارو سەربەخۆ، پەیکەربەندی تۆڕدار، تیمی کار، لێژنەکانو ئەنجومەنەکان، بە کۆمەڵ، پەیکەربەندیوادانراو، بە بێ سنوور).

لە گرنگترین ناسینەوەکانیشی:

١- خێرا وەڵامدانەوەی ژینگەو بارودۆخی دەوروبەری ڕێکخراو.

٢- تواناداری لە سەر داهێنانو دەرکردنی ئایدیای نوێ.

٣- بە کارخستنی پسپۆڕی پێشکەوتوو.

٤- تواناداری لەسەر مامەڵەکردن لەم هەڵوێستانەی کە بێ پرۆگرامنو ئامانجو مەبەستیان دیار نییە.

هەرچی خەوشەکانییەتی ئەمانەن:

١- ململانێو هاودژی نێوان ئەندامەکانی بەهۆی نەبوونی پەیکەربەندی دیاریکراوو سیستەمی دیار.

٢- نەبوونی وێناکردنو ئامانج ناڕوونو نادیاری.

٣- ئاستەم دابەشکردنی کار بۆ یەکە سەربەخۆکان.

٤- ئاستەم بەکارخستنی سیستەمی فەرمیو یاساو ڕێوشوێنی دیاریکراو.

بە بۆنەی دووەم ساڵیادی گۆڤارەکەتانەوە پیرۆزبایییەکی گەرم ئاراستەی سەرجەم کارمەندانو ستافی گۆڤاری بڕیاری ئازیز دەکەین، هیواداریین هەمیشە لە برەودا بن بە ئاراستەی خزمەتکردنی بواری ڕۆژنامەگەری کوردی، هەروەك چۆن بەڕێزتان داهێنەرو ڕێچکەشکێن بوون لەو بوارەدا کە گۆڤارەکەتان هەڵگری ئەو پەیامەیە، ئاواتەخوازین هەمیشە کاری جوانترو داهێنەرانەتر ئەنجام بدەن، ئێمە دڵنیاین لەوەی کە گۆڤارەکەتان هەڵگری ناسنامەیەکی سەربەخۆیەو بە شێوەی زانستیو ئەکادیمی کار لەسەر بواری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی دەکات، هیواداریین هەمیشە هەڵگری ئەم ناسنامەیە بنو جێگەی متمانەو گومانی باشی ئێمەی خوێنەر بن، دووبارە پیرۆزبایتان لێ دەکەین.

**کارمەندانی**
**چاپخانەی سەردەم**

# کەسانی سەرکەوتوو چۆن کاتەکانیان بەسەر دەبەن؟

و: ئەمیر ئەحمەد عەبدولقادر

**یەکەم:**

**بەسەر کاتەکانتدا زاڵ بە:**

١- ئەوە لە مێشکی خۆت دەربکە (کات ئازادە):

بێگومان بیرکردنەوە لە شتە دەست لێدراوەکان وەکو ئۆتۆمبیلو خانووەکان...، ئاسانترە لە بیرکردنەوە لە کات ئەمەش لەبەرئەوەیە کە بەهادارن، بەڵام چونکە کات نابینرێو دەستی لێنادرێ ئەوا وەکو پێویست رێزی لێنانرێت، ئەگەر یەکێك زێڕو گەوهەرت لێبدزێت پەرێشان دەبیو پۆلیس لەم تاوانە ئاگادار دەکەیتەوە، بەڵام دزینی کات یان بە فیڕۆدانی کات شتێکی ئاساییەو تەنانەت بە تاوانیش ناژمێردرێ، بەڵگەی ئەوەش زۆرجار گوێبیست دەبین کەسێك دەڵێت: ئەوشتە بکە لە کاتی ئازادی خۆت، واتە ئەوە ئەنجام بدە کاتێك سەرقاڵی هیچ کارێکی گرنگ نیت، بەڵام لە ڕاستیدا پێویستە هیچ کاتێك نەبێ بە ناوی کاتی ئازاد.

٢- بەرهەمی زیاتر لە بەرهەمی ئێستاکەت بۆ هەوڵەکانت مەزندە بکە:

ئەگەر وەها بیربکەیتەوە کە بەڕاستی کاتەکەت یەکسانە بە بەرهەمێکی مەزن سەرسام نابی کە خۆت دەبینی ئەو بەرهەمە دەچنییەوە، ئەوەی ڕوودەدات ئەمەیە کە نرخی کاتی بە فیڕۆدراو دەزانیت، دوای ئەوە دەست دەکەیت بە گەڕان بە دوای شێوازێك بۆ کەمکردنەوەی ئەو بەفیڕۆدانە کە هۆکارەکەی نەشیاویو بێتواناییە، هەر ئەوەش گرنگترە دەست بکەی بە هەڵبژاردن بەشێوەیەکی وردتر بۆ پڕۆژەو خواستەکانو بەرهەمی باشتر بەدەست بێنی، پێویستە کاتەکانت بە کەس نەبەخشی تەنها بە ئارەزووی خۆت نەبێ، پێت وانەبێت کە کاتی کەسێکی تر بەهادارترە لە کاتی تۆ.

٣- وردەکاری لە کاتو هەوڵو کۆششەکانتدا بکە؟

ئەگەر لەو کەسانە بیت کە ناتوانن بەشێوەیەکی باش کاتەکانیان بەسەر بەرن هەوڵبدە تۆمارێك بۆ خۆت دابنێ کە خشتەی کاتەکانی تێدا بنووسیتو ئەو کاتە بنووسی کە لە جێبەجێکردنی هەر کارێك لە کارەکانت بەسەرت بردووە، ڕەنگە ئەم شێوازە پێویست نەبێت بۆ کەسانێك کە بە باشی کاتەکانی خۆیان بەسەر دەبەن، بەڵام سەبارەت بە یەکێك کە لای ئەستەمە کاتەکانی بە باشی بەسەر بەرێت پاراستنی تۆمارێك دەکرێت سوودمەند بێت وەکو هۆکارێکی دەست نیشان کردن، چونکە ئەو تۆمارە کاریگەری کتوپڕی هەیە، تەنانەت بۆ خەڵکانێك کە شارەزاو پسپۆڕن کاتێك هەست دەکەن چەندین کاتیان بە سانایی بەفیڕۆ دەڕوات، بێگومان ئەو تۆمارە بوارێکی گەورە بەجێ ناهێڵێت.

**دووەم:**

**خۆت ڕێکبخەو کارە پێشینەکانت ڕیز بکە:**

بێگومان زانیاری جیاواز لە گرنگی ئەرکەکانی ڕۆژانەت کارێکی زیندووە، ئەمە ئەو شوێنەیە کە زۆرێك لەو کەسانەی دەتوانرا ببنە پسپۆڕی بە سەربردنی کات تێیدا گومڕا بوون، ئەوانە لیستێك بۆ ئەرکەکان دروست دەکەن، بەڵام کاتێك دەست بە جێبەجێکردن دەکەن، ئەوا هەموو ئەرکەکان بە یەکسانی مامەڵەیان لەگەڵ دەکەن، بۆ ئەوەی بتوانی کاروبارەکانت ڕێکبخەی، پێویستە ئەم خاڵانە جێبەجێ بکەیت:

١- پێویسته ئامانجەكانت دەستنیشان بكەیتو تۆماری بكەیت.

٢- هەوڵو چالاكییەكانت چڕبكەوە لەسەر سەرچاوە بەسوودەكان بۆ كارەكەت. بێگومان ئاگاداربوون لە شتێك كە باشترین ئەنجام بدات بە دەستەوە رزگارت دەكات لە بایەخدانو وابەستە بوون بەو سەرچاوانەی كەمتر بە سوودن یان هیچ یارمەتیت نەدەن بۆ سەركەوتن، لەوانەیە وا پێویست بكات لە ٨٠٪ی سەرچاوەكانت پشتگوێ بخەی یان لە ٨٠٪ی ئەو سەرچاوانە دوورخەیتەوە كە خستبووتنە پێشینەی كارەكانت.

٣- سەرجەم ئەركەكانی رۆژانەت تۆمار بكە، چەند هۆكارێكی كاریگەر هەیە كە ئەم ئامۆژگارییە باش دەكات، لەوانە:

أ- ئەگەر هاتوو ئەركەكان نووسرابن بە شێوەیەكی قوڵتر بخەوی، چونكە بیروهۆشت سافو بێگەرد دەبێ، كاریگەری خەو بەم جۆرە نابێت لەسەر كاری بەیانی.

ب- ئەگەر هاتوو ئەركەكان نوسرابنەوە ئەوا ژیریت ئازاد دەبێ، تا وەكو كێشەكان چارەسەر بكات، نەك تەنها بە بیرت بێنێتەوە، بەم شێوەیە هەوڵو تەقەلای ژیری ئاراستەی پرۆسەیەك دەكرێت ئەویش دۆزینەوەی ئەنجامەكانەو نەك بۆ دوو پرۆسەی چارەسەرو وەبیرهێنانەوە.

ج- ئەگەر ئەركەكان تۆمار كراوبن ئەوا تۆ هەنگاوێكت ناوە بەرەو پابەند بوون، ئەگەر هاتوو ئەركەكە تۆمار نەكرابوو ئەوا وادیارە شایەنی جێبەجێ كردن نییە.

٤- با بەرنامەكانت گشتگیر بێت بۆ كاتەكانو ئەركە پێشینەكانت. بۆئەوەی بەرنامەی كارت كرداری بێ پێویستە لە سەرت كە:

* پشت بە یادەوەری شێوێندراوو تێكدراو مەبەستە كە لەسەر پارچە كاغەزی فڕێدراو لێرەو لەوێ نووسراوە.

* پشت بە پارچە كاغەز مەبەستە لە نوسینگەكەت یان لكێنراوە بە بەفرگرەوەو شتی لەم جۆرە بە هۆی موگناتیس.

* دڵنیابە لە بوونی بەرنامەی كارت لە تەنها جێگەیەك بە لایەنی كەمەوە رەنگە وا باشبێ لە رۆژژمێرێك دابێ لە گیرفانت یاخود لە ناو كۆمپیوتەر.

* با بەرنامەی كارت هەردەم تازە بێت.

* دڵنیابە كە بەرنامەكەت هەموو كات لە بەر دەست دابێت.

٥- بە شێوەیەكی رێكوپێك بەرنامەی كارەكانت بپشكنەو هانی بەردەستەكانیشت بدە هەمان شت ئەنجام بدەن، بە شێوەیەكی خولیو بەردەوام بە بەرنامەی كارەكانتدا بچۆرەوە، بێگومان یەكەم شت لە بەیانیاندا ئەنجامی بدەی بێ دابڕان تەماشاكردنی ئەو بەرنامەیەیە، هەر كاتێك ئەرك بەسەر بەردەستەكانتدا دەدەی دڵنیابە ئەوان پارێزگاری لە لیستی ئەركە داواكراوەكاندا دەكەن، لە كۆبوونەوەكانی داهاتوو داوایان لێ بكە لیستەكان ئامادە بكەنو بە كاریان بهێنن وەكو بنچینەیەك بۆ راپۆرتەكەیان لەسەر كارەكە، هەروەها دڵنیابە هەر كاتێك بەم شێوەیە لیستت بەكارهێنا ئەو كات دڵنیا دەبی كە ئەو ئەركەی راتسپاردووە بە لە بیرچوونەوە كۆتایی نایەت.

٦- برگەو بەشەكانی لیستەكەت بە وردیو بە گوێرەی توانا دەستنیشان بكە. پێویستە لیستەكەت گشتگیر بێت، بەڵام پێویستیشە زۆر دوورودرێژ نەبێ، ئەگەرنا خۆت ناچار دەكەی زیاتر لە توانای خۆت ئەنجام بدەی، بەر لەوەی نوسینگە بەجێ بهێڵی شەش شت یا زیاتر یا كەمتر بنووسە كە ئەمرۆ نەتتوانیوە ئەنجامی بدەیت، پێویستە سبەینێ هەر چۆنێك بێ ئەنجامی بدەی، بەم شێوەیە هەوڵەكانت زیاتر چڕدەكەیتەوەو بە زوویی تێبینی دەكەیت كە بەرهەمەكانت باشترو زۆرتربن.

٧- كاتو بەرواری ئەركەكانت لەسەر بەرنامەی كار دیاری بكە. ئەركە داخوازی كراوەكان لە ناو بەرنامەكەت دابنێو پێویستە پابەند بی بە جێبەجێكردنی هەر شتێك لە بەرنامەكەتدا بێت، باشترین رێگەش بۆ پابەندبوون هەموو ئەركێك كاتی خۆی بۆ دیاری بكرێت.

٨- ئەگەر هاتو بەر پرس بووی بیر لە بەرنامە كاری یاریدەدەرانت بكەرەوە.

پێویستە لەسەرت لیستی ئەركەكانی یاریدەدەرەكانت ئامادە بكەیت یاخود داوایان لێ بكەی خۆیان ئەمە ئەنجام بدەن.

٩- بەرنامەی كار بۆماوەیەكی درێژ دابڕێژە زۆرێك پلان دارێژەرانی كات بەرنامەی كار بۆماوەی درێژ دادەڕێژن، تەنانەت هەندێكیان بەرنامەی كاری مانگانەیان دەزانن، پێشوەخت دەزانێو بەر لە مانگێك زۆربەی ئەو گفتوگۆ تەلەفۆنیانە ئەنجامی دەدات، هەندێ كەس ئەو كاتە مەزەندە دەكەن كە پێویستیان پێیە بۆ هەر پرۆژەیەك كە لە بەرنامەی كاریاندایە تا كۆتایی دێت داوای ئەو بەرنامەی كاری هەفتانەو مانگانەو تەنانەت ساڵانەش بەكار دەهێنن بۆ ئەنجامدانی ئەركەكانیان.

## خەندەی كارگێڕی

## پزیشکی ئامارناس

نەخۆشێك بە پزیشكەكەی گوت: ((قوربان تۆ بڵێی من بە زیندوویی و سەلامەتی لەم نەشتەرگەرییە بێمەدەر؟))

پزیشكەكە گوتی: (( ئەوە هەر گومانی تێدانییە.. من بەو پەڕی دڵنیاییەوە پێت دەڵێم: لە ژووری نەشتەرگەری بە زیندوویی دێیتە دەرەوە)).

نەخۆش: ((قوربان.. چۆن تا ئەم ئەندازەیە دڵنیایت؟))

پزیشك: (( خۆی لەڕاستیدا بە شێوەیەكی گشتی (٩) نەخۆش لە (١٠) نەخۆشی من، بە زیندووی لە ژووری نەشتەرگەری نایەنەدەر. هەر دوێنێ بوو، نۆیەمین نەخۆش تەمەنی درێژی بە ئێوە بەخشی. كەواتە ئێوە دەیەم نەخۆشنو ئەمەش دەریدەخات.. بێ دوودڵیو دڕدۆنگی كە ئێوە زیندوو دەمێننەوە)).

# چۆن کۆبوونەوە کورت و بەرهەمدارەکان دەبەستێت؟

د. محمد احمد عبدالجواد
و: حسین مەحمود هەڵەبجەیی

(هەڵسەنگاندن)

کرداری هەڵسەنگاندن ئەمانە دەگرێتەوە:

أ — پێوەری تواناى خۆت وەکو لێپرسراوێك بۆ بەرێوەبردنی کۆبوونەوە.

ب- هەڵسەنگاندنی کاریگەری کۆبوونەوە بە شێوەیەکی گشتی.

ج- ئایا شتێك هەیە پشتی پێ ببەسترێت لە کرداری هەڵسەنگاندندا؟

ڕاهێنان/خۆت هەستە بە هەڵسەنگاندنی کۆبوونەوەکە.

خێرا دوای یەکەمین کۆبوونەوە کە پێی هەڵدەستیت خۆت هەستە بە هەڵسەنگاندنی کۆبوونەوەکە، تاوەکو چاوکراوە ببیت بە توخمە کاریگەرە سەرکەوتووەکان یان شکستەکان لە کۆبوونەوەکەدا، ئەم لیستە پێشکەش بکە کە پێکهاتووە لە حەوت ئاماژەی پەیوەندیدار بە توانای ئەندامانی کۆبوونەوەکە یان لیژنەکە کە کۆبونەتەوە...

تکایە بازنەیەك بکێشە بە دەوری ئەو ژمارەیەدا کە بە شێوەیەکی دروست ڕاپەڕاندنی ئەندامان دەستنیشان دەکات.

١- بەشدارییەکی بەرز هەیە لە نێوان ئەندامانی کۆبوونەوەدا.

دروستە- ١- ٢- ٣- ٤- ٥ نادروستە.

٢- پەیمانو پابەندی ئەندامان بۆ بڕیارە دەرکراوەکانی کۆبوونەوە بەم شێوەیە :

بەرزە ١- ٢- ٣- ٤- ٥- نزمە.

٣- وتوێژەکە لە کەسێکەوە دەگوازرایەوە بۆ کەسێکی تر لە کاتی کۆبونەوەکەدا:

دروستە- ١- ٢- ٣- ٤- ٥- نادروستە بە یەکجار.

٤- مامەڵەکردن لەگەڵ هەستو سنورەکاندا بە تەواوەتیو بابەتیانە ئەنجامدرا:

دروستە- ١- ٢- ٣- ٤- ٥ نادروستە بە یەکجار.

٥- بەکارهێنانی شێوازی ئاشکراو بابەتیانە بۆ دیاریکردنی گۆشەکانو ڕێگا چارەیان ئەنجامدرا:

دروستە- ١- ٢- ٣- ٤- ٥ نادروستە.

٦- مامەڵەکردن لەگەڵ نەگونجاندنی پیادەکردندا بە شێوەیەکی دروست ئەنجامدرا:

دروستە- ١- ٢- ٣- ٤- ٥ -نادروسە بە یەکجار.

٧- دەتوانرێ سەرکەوتنی گشتی بۆ بەشداری ئەندامانی کۆبوونەوە دیاری بکرێ:

بەرزە- ١- ٢- ٣- ٤- ٥ -نزمە

کلیلی ڕاهێنان

ئێستە ....

ئەو ژمارانە کۆبکەرەوە کە لە ناو بازنەکەدایە ... ئەو کاتە دەتوانیت ڕادەی سەرکەوتنی کۆبونەوەکەت دیاری بکەیت بەم شێوەیە:

* ئەگەر ئەنجامەکە کەمتر لە (١٥) نمرە بوو ئەوە کۆبونەوەکە زۆرباشە.

* ئەگەر ئەنجامەکە لە (١٥ — ٣٠) نمرە بوو ئەوە کۆبونەوەکە مامناوەندیە.

* ئەگەر ئەنجامەکە بەرزتر بوو لە (٣٠) نمرە ئەوە کۆبونەوەکە خراپە.

کۆبونەوەکەت هەڵسەنگێنە..... بە ئاسانی.

دوای کۆتایی کۆبوونەوەکە ئەم هەڵسەنگاندنە دابەش بکە بەسەر ئەندامەکاندا.

ئەو نمرەیە تۆمار بکە کە گوزارش لە ڕاوبۆچونی تۆ دەکات لە ڕادەی سەرکەوتنی کۆبوونەوەکە، لە بەدیهاتنی ئامانجەکانی یان بەدی نەهاتنی... پێویستە هەڵسەنگاندنەکەت ئەم خاڵانە بگرێتەوە:

(پێش کۆبوونەوە — لە کاتی کۆبوونەوەدا — دوای کۆبوونەوە):

٠ - ١ - ٢ - ٣ - ٤ - ٥ - ٦ - ٧ - ٨ - ٩ - ١٠

پێشنیارت چییە تاوەکو ئەم کۆبوونەوەیە پێی هەستێ لە دانیشتنی داهاتوودا؟

لە پەراوێزی توێژینەوەکەدا:

١- ئەو ڕەوشتە پەروەردەییو عورفە کارگێڕیانەی یارمەتی سەرکەوتنی کۆبوونەوە دەدەن.

٢- ئەو ڕاپۆرتانەی لە کۆبوونەوەدا پێشکەش دەکرێن.

٣- دە ئامۆژگاری بۆ ئەوەی ڕاپۆرتەکەت بخوێنرێتەوە.

ئەو ڕەوشتە پەروەردەییو نەریتە کارگێڕیانەی یارمەتی سەرکەوتنی کۆبوونەوە دەدەن:

ئاگاداربە کاتێ سەرۆکیت یان بەشداربوو، بە شێوەیەکی سادە نەڕوانیتە شورا (ڕاوێژ)و بەبێ نرخو بەهاو تەماشای نەکەیت.

* کەسێ دەست نەکات بە وتوێژ مەگەر بە مۆڵەتی سەرۆکی کۆبوونەوەکە،

باشتر وایە نۆرە دابنرێت بۆ دواندن ئەگەر ژمارەکە زۆر بوو.

* ئەگەر سەرۆکی کۆبوونەوەکە فەرمانیدا قسەکەرەکە قسەکانی دەپچڕێنێت، چونکە سەرۆکی کۆبوونەوە لە تایبەتمەندێتی خۆی تێ ناپەڕێنێت.

* ڕێگا نەدرێت بۆ گەڕانەوە بۆ سەر بابەتێك کە وتوێژی لە سەرکرابوو، یان بڕیارێکی دیاریکراوی لە سەر درابوو، مەگەر بە هۆی سەرهەڵدانی هۆیەکی کتوپڕەوە کە نەزانراو بوو بێت لای هەموان لە کاتی ئەو بڕیار دەرکردنەدا کە ڕەوتێکی تر بگرێتە خۆی بۆ وتوێژکردن.

* متمانەی تەواو لای ئەندامی بەشداربوو بە ڕای پێچەوانە بەرامبەر بە ڕای ئەم، مادام هەمووان کۆك بوون لە سەری بە شێوەیەکی دروستو ڕاوێژێکی ڕاستەقینە، بێگومان بەرەکەتی تێدادەبێتو سەرەنجامی باش دەبێت هەرچەندە زۆر دوورە لە ڕاوبۆچوونی ئەمەوە.

* ئەندامی بەشداربوو پێویستە وریابێتو دووربێت لە هەواو ئارەزوو، یان حەزکردن لە سەرکەوتنی لای خۆی، ئاگاداری زاری بێت بەو واتایانەوە بدوێتو شتێك بڵێت کە سوودی بابەتەکەی تێدابێت... ئەگەر نا ئەوە بێدەنگی باشترو شیاوترو پارێزترە.

* پێویستە لە کۆبوونەوەدا بە زۆری داوای لێخۆشبوون بکرێت، وەك چۆن ڕێگە لە بریندار کردنی بەرامبەر دەگیرێت مەگەر بۆ بەرژەوەندییەکی شەرعیو ئاشکرا، کە ئەنجام نەدرێت مەگەر لە ڕێگەی ئەو بریندارکردنەوە لە بەردەم ئەو هەمووە ژمارەیەدا!

* ئەو کەسەی کە درەنگ دێت لە کۆتایی کۆبوونەوەکەوە دابنیشێت، مەگەر لەوەو پێش شوێنی هەموو کەسێك دیاری کرابێت.

* دەنگ بەسەر سەرۆکی کۆبوونەوەدا بەرزنەکرێتەوە، گرنگی بدرێت بە ڕێزگرتنیو ڕێزلێنانی.

* ئاگاداری بکرێت لە قسەپچڕینی ئەوانی تر، گاڵتەپێکردنیان لە کاتی لێدوانیانو بەدوادا چوونیاندا، چونکە دەبێتە هۆی ئازاردانو دڵشکاندن.

* کۆبوونەوەکە بە نزاو هیوای سەرکەوتن کۆتایی پێبهێنرێت.

ئەو ڕەوشتە پەروەردەییو نەریتە کارگێڕیانەی یارمەتی سەرکەوتنی کۆبوونەوە دەدەن:

* ئەصل لە ڕاپۆرتدا، ئاشکرایی ئامانجە لە پێشکەشکردنیدا (تەنها ئاگادارکردنەوە، لێپرسینەوە، دۆزی کێشە یان بڕیار وەرگرتن....).

* نابێ، قسەی ڕاپۆرت خوێنەرەکە بپچڕین، مەگەر بۆ ئاشکراکردنەوەی هەندێ وشە یان دەستەواژە، لەسەر هەموو ئەندامێ پێویستە، هەموو تێبینییەکان تۆماربکات لە کاغەزێکی تایبەتیدا، تا کاتی وتوێژ دێتە پێشەوە.

* باشتر وایە لە ڕاپۆرتەکاندا بڕێك لە کات بدرێت بە ئەندامان پێش دانیشتنەکە تا توێژینەوەی لەسەر بکات، بە تایبەتی ئەگەر داوای بڕیار وەرگرتن بکرێ لەسەر شتێ کە هاتبێت تێیدا.

* بەندەکانی ڕاپۆرتەکە وتوێژیان لە سەر دەکرێت (دوای خوێندنەوەی) بەند بە بەند، لە هەر بەندێکدا پێکبێن لەسەر هەر شتێكو ڕاسپاردەکانی ئەو بەندە تۆماردەکرێت، تاوەکو جارێکی تر نەگەڕێنەوە بۆ وتوێژکردن لە سەری.

* لە ڕاپۆرتەکاندا دەبێ ڕەچاوی کورتکردنەوەی بابەتەکە بکرێت بە شێوەیەکی گشتی، لەگەڵ دابەزاندنی وردەکارییەکان بەو پاشکۆیانەی تایبەتە بە ڕاپۆرتەکەو دەتوانرێت بگەڕێتەوە سەری ئەگەر کۆبوونەوەکە خواستی شتێکی تیادا ڕوونبکرێتەوە.

* باشتر وایە خشتەو وێنە بەکاربهێنرێ بە هەموو جۆرەکانییەوە، نەخشەش تاوەکو ببێتە یارمەتی دەرت بۆ ڕوونکردنەوە خاڵی دیاریکراو، هەرچەندە ئەم شێوازە ڕووخسارێکی ڕونترو جوانتر بە ڕواڵەتی ڕاپۆرتەکەت دەدا، بە شێوەیەك وشکی پەرەچاپکراوەکان دەبەزێنێ... ڕەخساندنێکی زیاترت بۆ دەستەبەر دەکات لەگەڵ خوێنەرەکانتا بە شێوازێ باشتر متمانە پەیدا دەکەن.

دە ئامۆژگاری بۆ ئەوەی ڕاپۆرتەکەت بخوێنرێتەوە:

* چۆن دەدوێیت، هەرواش بنووسە.

* دەربڕینی کورتو بەندی کورت بەکاربهێنە.

* ئەگەر ڕاپۆرتەکەت پشتی بە تێبینییەکانتو بڕیاری تایبەتی خۆت بەستبوو، ئەوە ڕاناوی قسەکەری تاك بەکاربهێنە... بۆ نموونە (لەو بڕوایەدام) لە بری (لەو بڕوایەدایە) یان (لەو بڕوایەداین).

* ئاگاداری تانەدان بە لە خوێنەر یان سوکایەتی کردن پێی.

* پرسیارەکان تۆمار بکەو وەڵامیان بدەرەوە.

* پلان بۆ سەرەتاو ناوەڕاستو کۆتایی دابنێ.

* لە پێشکەشکردنەکەدا لە شتی ڕاهاتووەوە بگوێزەرەوە بۆ نوێ... لە شتێك کە کۆکن لەسەری بۆ شتێ جیاوازی دەوروژێنێ.

* ئاگاداری ناوەکانو نازناوەکانو ئاستەکان بە.

* دوورکەوەرەوە لە ڕاستی گەلێك کە هیچ مەبەستێك ئەنجام نادات، دڵنیابە لە بوونی هۆکار بۆ هەموو ڕاستییەك کە باسی دەکەیت.

* دوورکەوتنەوە لە دەستنیشانکردن، وێنەی ڕوونکردنەوەو شێوازەکانو نموونە بەکاربهێنە.

## گرنگترین سەرچاوەکان


١- حسين القزاز صلاح الدين عبدالباقي، احمد ماهر (الدكاترة) سەرپەرشتیو پێداچوونەوەی/ احمد صقر عاشور. ( الدكتور) السلوك التنظيمي، الفصل السابع (الاتصال).

٢- خبراو مركز الخبرات المهنية لادارة البرنامج التدريبي، ادارة الاجتماعات.

٣- عبدالفتاح دياب ( الدكتور)، البرنامج التدريبي (ادارة الاجتماعات) مجموعة الاستشارية العربية.

٤- سهيل فهد سلامة، اداره الوقت منهج متطور للنجاح، المنظمة العربية للعلوم الادارة، سلسلة البحوث رقم ٣٢٠.

٥- مالكوم بيل... ترجمة/ مشيرة محمود عبدالرحمن، الاجتماعات كيف نجعلها ناجحة؟ مراجعة: يوسف محمد.

٦- ماريون اى هاينز، ترجمة محمود موسى، زهير الصباغ (الدكاترة) مراجعة: زكي راتب غواشة، زكي محمد الحسن، فصل الادارة اداء الجماعة.

٧- نادر ابو شيخة (الدكتور)، دبي (عمان)... ادارة الوقت.

٨- هشام الطالب، المعهد العالمي للفكر الاسلامي، دليل التدريب القيادي، سلسلة التنمية البشرية (رقم ١) فصل ترؤس اجتماع.

٩- المركز العربي للتطوير الاداري، ندوة مهارات المديرين الجدد.

١٠- هيفا دومند... ترجمة مصطفى ادريس، مراجعة: يوسف محمد القبلان... اتخاذ القرارات الفعالة، دليلك العملي في الادارة.

سەرچاوە بیانییەکان:

1_ MOER BLOODY MEETINGS
THE HUMAN SIDE OF MEETINGS
VIDEO ORTS PRESENT

# بەڕێوەبەری سەرکەوتوو!!

و: کارۆخ محەممەد وەرتێ

هەرچەند مرۆڤ داهێنەرو کارامەش بێت، لە کۆتاییدا دەگاتە شوێنێك کە ناتوانێت لە سنوری تواناکانی زیاتر تێپەڕێت. تەنانەت ئەگەر کەسەکە سەرۆکی ڕێکخراوێکی گەورەش بێت، لەم قۆناغەدا پێویستە ڕێگە بدات هەندێك لە کارەکانو بەرپرسیاریەتییەکان بە کەسانی پسپۆر بسپێرێت. بەم شێوەیە بە خێراییەکی زیاتر بەو ئامانجانەی دەگات کە پێشتر دیاریکردووە. بەڵام بۆ هەبوونی ئەم کارامەییە دەبێت:

* ئەرکی فەرمانبەرەکان بە شێوەیەکی ورد دیاری بکات:

لە زۆربەی بەڕێوەبەرایەتیو دامەزراوەکان فەرمانبەران کاتێکی زۆر بە بێکار یان بە جێبەجێ کردنی ئیشوکاری لاوەکی بە فیرۆ دەدەن. ئەم جۆرە بێ ئیشوکات بە فیرۆدانە کاری گروپ لاواز دەکات، بۆیە ئەمە ئەرکی بەڕێوەبەرە کە ئیشو کاری هەر کەسێك بە وردی دیاری بکات تا ڕێگری بکات لە بە فیرۆچوونی وزەی فەرمانبەرانی.

* لە هەڵبژاردنی کەسەکان ورد بێت:

لە پێدانی بەرپرسیاریەتیو هەڵبژاردنی کەسەکان دەبێت ئاگاداری لێهاتوویيو کارامەیی ئیشو کاری کەسانی خوارەوەی خۆی بێت، چونکە بۆ وێنە ئەگەر کارێك لە سەرووی توانای ڕاستەقینەی فەرمانبەرێك بێت، دەبێتە هۆی نائومێدیو خەمۆکی فەرمانبەرەکە، سەرەڕای ئەمەش لەوانەیە فەرمانبەرەکە لێهاتویی سەرەتایی نەبێت، بەڵام حەزو زەوقێکی تایبەتی هەبێت. هەر ئەو مەسەلەیە بەسە بۆئەوەی کە بەرپرسیاریەتییەکی بەرچاوی پێ بسپێرین.

*هەوڵ بدات وردە وردە زانیاری بە فەرمانبەرەکان بدات نەك بە شێوەیەکی چڕو بە یەکجار:

لە کاتی سپاردنی بەشێك لە بەرپرسیاریەتییەکانی خۆی، دەبێ وردبین بێت کە توانای ڕاستەقینەی کەسەکە چەندەو وردە وردە زانیارییەکانی بخاتە ژێر دەستی. ئەگەر بەڕێوەبەر بیەوێت بە یەکجار بابەتی ئاسانو ئاڵۆز بخاتە ژێر دەستی بەرپرسە نوێیەکە، دەبێتە هۆی ئەوەی کە کارامەیی پێویست بە دەست نەیەت.

* فێرکردنی فەرمانبەرەکان بە گرنگ دابنێت:

کاتێك کە تاك بەرپرسیاریەتییەکی نوێ دەگرێتە ئەستۆ، بە هۆی نەبوونی ئاشنایی لەگەڵ کارەکە لەوانەیە سەرەتا کۆمەڵە پرسیارو گرفتێکی زۆری بەرەو ڕوو بێتەوە، لەم حاڵەتەدا بەڕێوەبەرێکی سەرکەوتوو لە هەر هەلێك بۆ فێرکردنی فەرمانبەرانی خۆی سود وەردەگرێت.

* دەست لە ئیشو کاری فەرمانبەران وەرنەدات:

هەر ئەوەی کە کارێکت بە یەکێك لە ژێر دەستەکانی خۆت سپاردو دڵنیا بوویت کە فەرمانبەرێکی ڕاستگۆو کارامەیەو لە کارەکەیدا خۆی ماندوو دەکات، دەست لە کارەکەی وەرمەدە، ئەگەر تووشی هەڵەیەك بوو، یەکسەر هەڵەکەی بە ڕوودا مەدەرەوە، چونکە دەستێوەردانی بێ هۆ دەبێتە هۆی سەرلێتێکچوونی فەرمانبەران، لە یادتان بێت پێدانی بەرپرسیارییەتی مانای پەرەسەندنو گەشانەوەیەکی ترە.

* لە هەڵەی لاوەکی فەرمانبەران ببورێت:

کاتێك کە لەسەر سەری فەرمانبەرەکەت دەوەستیتو بە بینینی بچوکترین هەڵە لەسەری دەکەیتە هاتو هاوار، لە یادتان بێت کە بەم کارە خراپترین گورز لە دامەزراوەو کۆمپانیاکەتان دەدەن. سەرکۆنەکردنو شکاندنەوەی فەرمانبەران دەبێتە هۆی نەمانی بڕوا بەخۆبوونیان، ئەگەر لە سەرزەنشتکردنو ڕەخنەگرتن ترسیان هەبێت، زیاتر ڕیسك دەکەنو ئەگەری بەرەوپێشچوونیان کەم دەبێت.

سەرچاوە: گۆڤاری (کانون خانوادە)، ژمارە ١٧٤، لاپەڕە ٥٨.

# وەستای گفتاریت یان وەستای کردار؟

و: ئەسکەندەر ڕەحیم

## گەر نازانی، ئەمە بیرۆکەیەکە نرخەکەی 25000 دۆلارە!

ئایا هەر زانینت هەیە یان کار؟ ئاخۆ ئاواتەخوازیت یاخود راستیخواز؟ وەستای قسانی یان کارامەی دەستان؟

لێرەدا بەسەرهاتی بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی ئاسن دەگێڕینەوە:

(ئیڤی لی) شارەزای بەرهەمهێنانو چالاکییە مرۆییەکانەو ئاشناییەکی باشی لەو بوارەدا هەیە، لە لایەن بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە، داوای لێکرا لە بەڕێوەبردنی کارگەی ئاسندا بە باشترین شێواز یارمەتی بدات. شارەزاکە زانیاری زۆری پێشکەش بە بەڕێوەبەرەکە کردو چەندان کارامەییو شێوازی زۆرترکردنی بەرهەمی بۆ روونکردەوە. بەڵام بەڕێوەبەرەکە وتی: (من کارو کرداری زۆرترم دەوێ، نەك زانیاری زۆرتر). پاشان درێژەی بە وتەکانی داو وتی: (ئێمە دەزانین دەبێ چی بکرێ. لە تۆمان دەوێ، بۆ راپەڕاندنی ئەوەی پێویستە بکرێ، فێری باشترین شێوازمان بکەیت. خۆ ئەگەر باشترین شێوازی کارکردنت فێرکردم، ئەوا چەندت پارە دەوێ، بە مەرجێك لەسنووری ژیرییدا بێ، پێت دەبەخشم).

(ئیڤی لی) وتی: (لە ماوەی بیست خولەکدا، دەتوانم فێری شتێکت بکەم، بە لای کەمەوە بەرهەمی کارگەکەت لە نیوە زۆرتر بکات). (ئیڤی لی) کاغەزێکی دایە دەست بەڕێوەبەرەکەو پێی وت: ( لەسەر ئەم کاغەزە، شەش شتی گرنگ بنووسە کە دەبێ سبەی ئەنجامیان بدەیت). بەڕێوەبەرەکە تۆزێ بیری کردەوە، سێ یان چوار خولەکی پێنەچوو، ئەوەی لێی داواکرابوو، ئەنجامی دا. پاشتر (ئیڤی لی) وتی: ( ئێستە ئەو شتانە بە پێی گرنگییان بۆ کۆمپانیاکەت، ریزبەند بکە). ئەمەش چوار یان پێنج خولەکی خایاند. پاشان (ئیڤی لی) پێی وت: ( کاغەزەکە بخەرە گیرفانتەوە، سووربە لەسەر ئەوەی یەکەم شت سبەی ئەنجامی بدەیت، ئەوەبێ کە کاغەزەکە دەربهێنیتو بێ ئەوەی بڕوانیتە بڕگەکانی دیکە، بڕگەی یەکەم بخوێنەرەوە. بە بڕگەی یەکەم دەست پێ بکەو تاوەکو بە تەواوەتی ئەنجامی نەدەیت جێی مەهێڵە. پاش ئەوەی لە بڕگەی یەکەم دەبیتەوە، بچۆرە سەر بڕگەی دووەم، پاشان سێیەم، ئیدی تا رۆژ تەواو دەبێ، بەم چەشنەبە.

گەر ئەم شەش بڕگەیەت رانەپەڕاند، پەرێشانو نارەحەت مەبە. لەبەرئەوەی گەر نەتوانی گشت بڕگەکان، بەم شێوەیە رابپەڕێنی، ئەوا لات روون بێ، بەشێوازێکی دیکەش بۆت دەست نادا. بێ شیرازەو رێورەوش، هەروەها بێ ریزبەندی بە گوێرەی گرنگی، رێی تێدەچێ بۆ راپەڕاندنیان، دە ئەوەندەی دیکەت پێبچێ.

ئەمە بەسەر کارمەندەکانیشتدا جێبەجێ بکە، بۆئەوەی تاقیبکەنەوە، دەرفەتێکیان پێ بدە. خۆشت چەند حەزدەکەی، تاقیبکەرەوە. پاشان چەکێکم بۆ بنێرە، هەم لەگەڵ خۆتو هەم لەگەڵ بەرزبوونەوەی بەرهەمدا شیاوو لە بار بێ).

دیمانەکە نیو کاتژمێر زیاتری پێنەچوو، دوای چەند هەفتەیەکیش بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە، چەکێکی بە بڕی (۲۵۰۰۰دۆلار) لەگەڵ نامەیەکدا بۆ (ئیڤی لی) نارد. لە نامەکەدا هاتبوو: (باشترین وانە لە ژیانمدا فێری بووم، ئەم وانەیە بووە، چونکە لە هەموویان زۆرتر قازانجی بۆم هەبووە. ئەوە تاکە بیرۆکەیەك بوو، یەك لە دوای یەك بە پێی گرنگیو لە پێشینەیی، دەست دەداتە ئەرکەکان).

تۆش گرنگترین ئەرکی سەرشانت بنووسە، پاشان بە گوێرەی گرنگییان ریزیان بکە. کارەکە لە بڕگەی یەکەمەوە دەست پێ بکەو هەتا لە بڕگەی یەکەم نەبیتەوە، مەچۆرە سەر بڕگەی دووەم. دواتر برۆ بۆ دووەمو سێیەم، ئیدی هەروا... واتە پێش راپەڕاندنی ئەرکی پێشوو، دەست بە ئەرکی داهاتوو مەکە. دوای لێبوونەوە لە شەش ئەرکەکە، کاغەزێکی دیکە ئامادە بکەو کردارەکە دووبارە بکەرەوە. ئەم رێورەوشەی خستووتە سەر ژیانت، دڵخۆشت دەکات. هەروەها ئەو خێرایییەی کە لە توانای راپەڕاندنی ئەرکەکاندایە، بە گوێرەی گرنگیان، سەرسامت دەکات. ئەم رێگایە ئاسانو کاریگەرە، شڵەژاوی لە ژیانتدا دەرەوێنێتەوەو لە ئێستە بە دواوە، خۆت لە چەرخو خولی بازنەی سەرگەردانیو تیاماندا، نابینیتەوە.

هۆکاری نووسینی ئەرکە یەکەمەکان لە رووی گرنگییەوە، روونە. لەبەرئەوەی راپەڕاندنی هەموو شتێکی گرنگ، بە سەرکەوتوویی لە رۆژدا، کارێکی جێبایەخەو راییکردنی زۆرێك لە ئەرکە ناگرنگەکانیش بە کات بە فیڕۆدان دادەنرێ. دڵنیابە لەو ئەرکانەی لە راپەڕاندنیاندا کات بەسەر دەبەیت بەراستی ئەرکی گەورەو گرنگن، چونکە بۆ پێشەوەو بە رێکوپێکی بەرەو ئامانجەکەت دەتجوڵێنن.

ئێستە ئەم یاسا زێڕینە فێربوویت: (راپەڕاندنی ئەرکەکان بەسەرکەوتویی، رۆژانێکی سەرکەوتوو دروست دەکەن. رۆژە سەرکەوتووەکانیش ژیانێکی سەرکەوتوو دەگەیەنن). ئەمەش ژیربێژییەکی ئاسانەو کەس ناتوانێ نکوڵی تیادا بکات. ئەم رێورەوشە بەندە لەسەر بنەمای یەکەمینەکان: (گەرچی دژوارترە، ئەو ئەرکە لە پێشترە، کە لە گشت گرنگترە). پاشتر هەموو جارێکو لەگەڵ گشت کەسێکدا، سەرکوتوو دەبی.

ئێستە پێویستە ببیتە یەکێك لەوانەی دەزاننو جێبەجێی دەکەن. هەر وەك بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە وتی: (کێشەمان ئەوەنییە کە نازانین، کێشەکە ئەوەیە دەزانینو جێبەجێی ناکەین). ئایا تۆ دەزانیتو وەستای گوتاریت یان دەزانیتو وەستای کرداریشیت؟ ئەگەر وەڵامەکەی نازانی، با یەکەم ئەرکت بە دوای وەڵامدا گەڕان بێت.....

سەرچاوە: المحفزە الإداریە.

# پشـــیله و ڕێوی

پشـــیلەیەك لە ڕێگەدا گەیشت بە ڕێوییەك، بە بیریداهات كە ڕێوی ئاژەڵێكی زیرەكو چوستو چالاكە، بۆیە سڵاوی لێكردو گوتی: حاڵتان چۆنە مام ڕێوی؟

ڕێــوی بــە لــە خۆباییبوونـــەوە تەماشایەكی پشیلەی كردو گوتی: ئەی بێچـــارە! ڕاوچی مشــك! تۆ چۆن وێرایت سڵاو لە من بكەیت! تــۆ چی دەزانیــت؟ چ هونەرێكت هەیە؟

پشیلە بە شەرمەوە وەڵامیدایەوەو گوتــی: مــن تەنها یــەك هونەر دەزانم.

ڕێــوی پرســی چ هونەرێــك دەزانیت؟

پشیلە گوتی: كاتێك سەگێك بە دوام بكەوێت، دەتوانم بچمە سەر درەختێـكو گیانــی خــۆم ڕزگار بكەم.

ڕێــوی پێكەنــیو گوتــی: تەنهــا ئەمــە؟ بەڵام مــن ســەد هونەر دەزانم. دڵــم پێت دەســووتێتو دەمەوێت پێت بڵێم كە پێویســتە چۆن هەڵســوكەوت لەگەڵ سەگدا بكەیت.

لــەم ئــانو ســاتەدا ڕاوچییەكو سەگەكەی گەیشتنە ئەوێ، پشیلە بە خێراییو یەكســەر چووە سەر دارێــكو هاواری كــرد: مام ڕێوی خێراكە ڕاكە تا ڕاونەكراوی!

تــا ڕێوی ویســتی كارێــك بكات، سەگەكە ڕێوی گرت.

پشــیلە هاواری كرد، ڕێوی تۆ بە ســەد هونەرەوە ئێخسیر بوویت، ئەگــەر وەكــو مــن تەنهــا یەك هونــەرت هەبوایــەو ئەوەندەش لــە خۆبایــی نەبوویتایە، ئێســتا نەدەگیرایت!

سەرچاوە: سایتی (شورای گسترش زبان فارسی).

# مریشك و گوڵە گەنم

مریشكێك لەگەڵ چەند هاوڕێیەكیدا دەژیا، ئەوانیش ســەگو مراویو پشیلە بــوون، مریشــكەكە زۆر چــالاك بــوو هەموو دەمێــك ئــارەزووی كاركردنو یارمەتیدانــی هاوڕێكانــی دەكرد، ڕۆژێكیــان بە نــاو كێڵگەكــەدا دەگەڕا گوڵە گەنمێكی دۆزییەوە، زۆر خۆشحاڵ بوو بیری كــردەوە وتی: دەتوانم نانی لێ دروســت بكــەم، بەڵام پێــش ئەوە پێویســتی بــە بڕێكی زیاتــر لە گەنم هەیــە بۆیە وتــی: گەنمەكە دەچێنمو بەرهەمی زیاتر دەدورمەوە!

بــۆ ئــەم كارە داوای یارمەتــی لە هاوڕێكانی كردو پێی وتن كە بەشداربن لە چاندنی گەنمەكەو هاوكاری كردنی، بــەڵام ئــەوان وتیــان ئــەوە كارێكــی گرانەو بە ئێمە ناكرێت، مریشــكی ئازا بێ هیــوا نەبوو بەردەوام بوو لەســەر بیرۆكەكەی خۆی هەســتا بە چاندنیو هەمــوو ڕۆژێك ئــاوی دەداو خزمەتی دەكرد تا گەیشــتە وەرزی پێگەیشتنو دوورینــەوە، بــۆ ئەم مەبەســتەش بە هەمــان شــێوە داوای یارمەتی كرد لە هاوڕێكانــی بە هەمان وەڵامی پێشــوو وەڵام درایەوە، مریشــكەكە هەســتا بە دوورینەوەیو پاشــان ویستی بیهاڕێتو بیكاتە هەویر بۆئەوەی نانی گەرمو بە تامی لێ دروست بكات بۆ جاری سێیەم هاوڕێكانی هاوكارییان نەكرد!

كاتێــك كە نانی گــەرم ئامادە بوو بۆنی ئەو كێڵگەیەی گرتبووەوە، ئەمەش سەرنجی هاوڕێكانی ڕاكێشاو تامەزرۆی ئــەوە بــوون تامێكی ئەو نانــە بكەن، مریشــكەكە پێی وتن: كــێ یارمەتیم دەدات لــە خواردنــی؟ هەموو بە یەك دەنگ وتیان ئێمە، بــەڵام ئەمجارەیان مریشكەكە ڕازی نەبوو، وتی: بێگومان نەخێــر، ئێــوە ناتوانن بەشــداربن لە خواردنــی لەبەرئــەوەی لە ســەرەتادا بەشدار نەبوون لە ئامادەكردنی.

# ئەم بەرهەمە نوێیانە کەوتنە بەر دیدەی خوێنەران

## نهێنی خۆشبەختی

• «نهێنی خۆشبەختی» بەشێوەیەکی زۆر سەرنج ڕاکێشانە باس لە نهێنیەکانی ژیان و ئاسوودەیی دەروون و هۆکارەکانی دەوڵەمەندبوون و نهێنی بەدەست هێنانی هەموو خواستەکان ئەکات.

• «نهێنی خۆشبەختی» کتێبێکە هەمیشە پێویستیت پێیەتی.

• «نهێنی خۆشبەختی» بۆ یەکەمجار لەکوردستاندا بە قەوارەیەکی گەورە و دیزاینێکی هونەری جوان و ٢١٠ لاپەڕەی هەمەڕەنگ و نایاب بەچەندەها بابەتی NLP و TQM لەسەر ئەندازەی دەروونی مرۆڤ و بابەتە نوێکانی گەشەپێدانی مرۆیی دەکەوێتە بەردیدەی خوێنەرانی بەڕێز.

• نووسینی: نووسەر و ڕۆشنبیر «عادل شاسواری».

• لەبڵاوکراوەکانی کتێبخانەی هەورامانە لە سلێمانی و لەم کتێبخانانەی خوارەوە دەست دەکەوێ: سلێمانی کتێبخانەی: «هەورامان، ڕۆشنبیر، مەریوان، سارا، ئەندێشە» هەولێر کتێبخانەی: نوسینگەی تەفسیر، مەحوی. هەروەها لەهەڵەبجە کتێبخانەی: هێمن.

# ئاراستەکردنی کڕیار بۆ هەڵبژاردنی بەرهەمێك

ئا: سەلمان حەمەئەمین

بە خۆییو لیستەکەی دەستییەوە، کڕیاری سوپەرمارکێتێك رووبەڕووی ئاستەنگی بڕیاردان لە هەڵبژاردنی پەنیرێك بۆ بەرچایی خێزانەکەی دەبێتەوە، رەفەکان پڕن لە دەیان جۆر.

ئایا دەبێت خۆماڵی هەڵبژێرێت یان بیانی؟ چ تامێك؟ چ جۆرێك؟ بە چ قەبارەیەك؟.....

بازارگەرەکان فێڵی سەرنجراکێش بەکاردێنن بۆ دەستەمۆ کردنی کڕیارەکان، لە پێناو کڕینی بەرهەمێك لە جیاتی بەرهەمێکی تر، لەبەرئەوە گرنگییەکی کەم بە خواردنی ناو پاکەتەکە دەدەن، کاری تەواو دەکەن بۆ سەرنجراکێشانی کڕیارەکان.

بازارگەری پلانی کۆمپانیایەکە بۆ فرۆشتنی بەرهەمێك. پلانی بازارگەری بە بەڕێوەبەرایەتی بەرێوەبەرێکی بازارگەری پێکدێت لە: ناونانی بەرهەمەکە، چۆنییەتی نرخ بۆ دانانی، چۆنییەتی لە پاکەت نانی، چۆنییەتی ریکلام بۆ کردنی، چۆنییەتی رازیکردنی کڕیار بۆ کڕینی.

بە کورتی ئامانجی بازارگەری بریتییە لە ئاراستەکردنی کڕیار بۆ هەڵبژاردنی بەرهەمێکی دیاریکراو.

پلانی بازارگەری زۆرجار بەوە دەست پێدەکات کە بەدواداچوون دەکرێت، بۆئەوەی بزانرێت زیاتر کێ جۆرە بەرهەمێکی دیاریکراو دەکرێت. فاکتەرەکانی رەگەز، تەمەن، پەروەردە، داهاتی کڕیارەکانی داهاتوو گرنگیان پێ دەدرێت.

دواتر تیمێکی بازارگەری پلانێك دادەنێت، ئەو پلانە بەشێکی دیاریکراو لە خەڵك دەکاتە ئامانج، بە تایبەت ئەوانەی کە زیاتر چاوەڕوانی کڕینی بەرهەمەکەیان لێدەکرێت.

بۆ نموونە فرۆشتنی عەترێك، ئامێرێکی کارەبایی، قەڵەمێك، خواردنێکی منداڵان، ئەمانە خۆیان لە خۆیاندا بانگەشەی تەکنیکی جیاوازی بازارگەری دەکەن، کەسانی خاوەن داهاتێکی باشو دەوڵەمەند عەتری گرانبەها دەکڕن، خوێندکاران قەڵەم دەکڕن، کەواتە پێویستە ئەو جۆرە فاکتەرانە لەبەرچاو بگیرێت کاتێك پلانێکی بازارگەری دادەنرێت.

وای دانێین کۆمپانیایەك هەستاوە بەداهێنانی بەرهەمێکی نوێ، ئەو بەرهەمەش پاودەرێکە دروستکراوە لە میوەی وشککراوە کاتێك لەگەڵ ئاوی گەرم تێکەڵ دەکرێت، پاودەرەکە دەبێتە گیراوەیەکی کرێمی میوە بۆ منداڵی ساوا، لێرەدا هەرچەندە منداڵە ساواکان دەبنە بخۆری بەرهەمەکە، بەڵام ئەوانەی کە دەیکڕن دایكو باوکیانن، بۆیە کۆمپانیاکە دایكو باوکان دەکاتە ئامانج، بە تایبەتیش دایکان.

بە دواداچوونێك دەریدەخات کە زۆربەی دایکان لە کاتی کڕینی هەر کاڵایەك بۆ کۆرپەکەیان دووخاڵ لەبەرچاو دەگرن.

١- دەیانەوێت منداڵە ساواکانیان تەندروست بن.

٢- دەیانەوێت دایکێکی باش بن.

بازارگەرەکان ئەمزانیاریانە بەکاردەهێنن بۆ ناونانی ئەم بەرهەمە نوێیە، بۆ نموونە بەرهەمەکە ناودەنرێت: (Healthy Start)، واتە (سەرەتایەکی تەندروست)، لە هەمان کاتدا سلۆگان (دروشم)ێکی بازارگەری دادەنێت: سەرەتایەکی تەندروست بدەرە کۆرپەکەت، ئەم سلۆگانە دوو پەیام هەڵدەگرێ، پەیامێکی ئاشکراو پەیامێکی شاراوە، ئاشکراییەکەی دایك ئاراستە دەکات بۆ پێدانی ژەمە سەرەتایەکی تەندروست، لە هەمان کاتدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەمە دەیکاتە دایکێکی باش، لەبەرئەوەی سەرەتایەکی تەندروست لە ژیاندا دەداتە کۆرپەکەی.

دواتر تیمە بازارگەریەکە بڕیار دەدەن چۆنو لە کوێ بەرهەمی میوەی سەرەتایەکی تەندروست بفرۆشن، پێویستە بڕیار بدەن لەسەر ئەوەی لە کوێ ریکلامەکان دابنێن، ریکلامەکان چی بڵێن. دەکرێت ریکلامەکە پشتگیری پزیشکێکی بەناوبانگی منداڵان لە خۆ بگرێت بۆئەوەی لایەنی تەندروستی بەرهەمەکە دووپات بکاتەوە.

ریکلامەکان بە دڵنیاییەوە کۆمەڵێك لایەن دووپات دەکەنەوە، وەك تامی باش، ئامادەکردنی ئاسان و پڕ لە ڤیتامین.

هەروەها پێویستە تیمەکە بڕیار بدات کە ئایا زیاتر گرنگی بەفرۆشتنی ناوخۆیی دەدرێت یان بەرهەمەکە دەنێردرێتە دەرەوەی وڵات، دەبێت ئاماژە بەوەش بکەین کە پێشتر دیزاینی پاکەتێکی سەرنجراکێش دەکرێت بۆ بەرهەمەکە، پاشان تیمەکە تێستی ناو و دروشمو ریکلامو دیزاینی پاکەتەکان دەکات لە ڕێگەی پیشاندانیان بە دایکان، تێبینی کردنی کاردانەوەیان.

لە کۆتاییدا بەرهەمە نوێیەکە لە رەفەی سوپەرمارکێتەکاندا دادەنرێت، ئەگەر بازارگەرییەکە کاریگەر بووبێت دایکان سەرەتایەکی تەندروست هەڵدەبژێرن لە دەستەی خواردنی منداڵان لە نێو رەفەکاندا.

# باج

وەهاب حەسیب محەممەد

بڕێکــی پارەی دیاریکــراوە لە داهاتی تاك، دەســەڵات (حکومەت) بە تۆبزیو بێ بەرامبەر لە هاوڵاتیانی وەردەگرێت، باج بە یەکێك لە داهاتە سەرەکییەکانی حکومەت دێتــە ئەژمــار، ئامانجــی دابینکردنــی خەرجییــە گشــتییەکانی دەوڵــەتو بەرزکردنــەوەی ئاســتی خۆشــگوزەرانی کۆمەڵانی خەڵكو دەستەبەرکردنی ئامانجە ئابوریو کۆمەڵایەتییەکانە.

باج لە لێکۆڵینەوە داراییەکاندا بایەخی زۆری پێدەدرێت، چونکە ســەرچاوەیەکی گرنگە بۆ دەوڵــەت، بایەخی باج بە تەنها ناگەڕێتەوە بۆ گەورەیی قەبارەو بڕەکەی، بە نموونــە وڵاتێکی وەك ئەمریکا داهاتی نەتەوەیــی لــە ٦٠٪ی زیاتــری پشــت بە داهاتی باج دەبەستێت، هاوکات بە هۆیەوە دەوڵــەت کار لــە چالاکی ئابــوری دەکات بە مەبەســتی دەســتەبەرکردنی ئامانجە ئابوریو کۆمەڵایەتییەکانی.

بــاج چەند جۆرێکــی هەیە: هەریەك لــەم جۆرانە لایەنی بــاشو خراپی خۆی هەیە، بە جۆرێك هەر دەوڵەتێك شێوازێك لــە وەرگرتنی باج پیادە دەکات کە گونجاو بێت لەگەڵ بارودۆخی ئابوری، پیشەسازی، کۆمەڵایەتی، ئەو دەڤەرەدا.

پێشــکەوتنی بــاج بەســتراوە بــە پێشــکەوتنی دەوڵەتــەوە، چونکــە بــاج زانســتو هونــەرە، لایەنە زانســتییەکەی بیــردۆزەو بنەماکانی بــاج ڕێکی دەخات، لایەنــە هونەرییەکەشــی شــێوازی جێبەجێکردنەکەیەتــی، هەردووکیــان تەواوکەرو یارمەتیدەری یەکترن.

لــەم ڕوونکردنەوەیــەدا دەردەکەوێت بــاج هۆکارێکــە بــۆ دابینکــردنو پێشکەشکردنی پێداویستیوخزمەتگوزارییە جۆراوجۆرەکان، کەمکردنــەوەی جیاوازی چینایەتــیو بەدیهێنانــی دادگــەری کۆمەڵایەتی، هەوڵــدان بۆ جێبەجێکردنی ئــەم ئامانجانــە لــە لایــەك، بوونــی هۆشــیاری بــاج لای هاوڵاتیــان هۆکارێکی ســەرەکیو کاریگەری بەدیهێنانی ئامانجە بنەڕەتییەکانــی باجە، نموونەی ئەمانەش دنیــای پێشــکەوتوون، بەداخــەوە ئەوەی لــە ڕۆژهەڵاتــدا بەنــاوی باجــەوە لــە خەڵکی وەردەگیرێت تالانکردنی ســامانی نەتەوەییــە، وەك ئەنگلــز باســی دەکات. نموونەی ئەمەش دەسەڵاتی عوسمانییەکان بوو، (بە تایبەت لە کاتی جەنگدا)، باجیان لەســەر هەموو داهاتو ســامانێك دادەنا، وەك: دانەوێڵــەو ئــاژەڵ، (بــە هەمــوو جۆرەکانییەوە)، پەلەوەر...هتد.

جۆرەکانی باج: بەشــێوەیەکی گشــتی پۆلێن دەکرێت بۆ دوو جۆر:

١- ئەو جۆرەیە لــە باج کە حکومەت بــە تەنهــا بــاج دەخاتە ســەر یەکێك لە لایەنەکانی ســامان، وەك: ســەرمایە، کۆی داهات...هتــد، بە مەبەســتی بە دیهێنانی هەموو ئامانجەکانی باج.

٢- لــەم جــۆرەی باجــدا حکومــەت شــێوازی چەندایەتی (زیاتر لە یەك) بڕی باج دەخاتە ســەر لایەنەکانــی باج، وەك: قازانج، موڵکانــە، کرێ، هەموو جۆرەکانی سەرمایە... هتد.

لــە وەرگرتنــی باجدا جــۆری دووەم باشــترەو بڵاوتــرە لە جیهانــدا. دەکرێت زیاتــر جۆرەکانی باج دەستنیشــان بکەین بەم جۆرانە:

أ- باجــی وەبەرهێنــان: ئــەو باجەیە دەخرێتە سەر شــمەكوخزمەتگوزارییەکی دیاریکــراو، لە کاتــی بەرهەمهێنان یاخود پێشکەشکردنیدا،عادەتەن ڕێژەیەکی سەدییە بەرامبــەر هەر یەکەیەکــی بەرهەمهێنراو یان بڕێك لە خزمەتگوزاری.

ب- باجی بەرزبوونەوەی دەســکەوتو داهــات (الضريبة تصاعديــة): یەکێکە لە شــێوە بەکارهێنراوەکان لــە پیادە کردنو وەرگرتنــی باجدا، دەســەڵات ڕێژەی باج زیاد دەکات بە هەڵکشــانی داهات، (داهاتی ئەومرۆڤــەی باج دەدات)، بۆیەش ناونراوە تەصاعــدی چون راســتەوانەو هەنگاو بە هەنگاوە بە نیسبەت داهاتی مرۆڤەکانەوە، واتە ڕێــژەی باجەکە زیاد دەکات، بە زیاد بوونی داهاتەوە ئەمەش زیاتر ئەو کەسانە دەگرێتــەوە میراتێکــی زۆر بەجێدەهێڵن یــان داهاتیــان بــەرزە، وەك: دکتــۆر، پارێزەر.. ئامانجی سەپاندنی ئەمجۆرە لە باج گردنەبوونــەوەی پارەیە لای چینێکی دیاریکراو.

ج – باجــی داهات: ئەم جۆرە لە باج لــەو کەســانە وەردەگیرێت کــە داهاتێکی دیاریکراویان هەیە، ســەرچاوەی داهاتەکە ســامانێك بێت وەك عەقــارات، قەواڵە... هتــد. یان مووچەیەکــی حکومەت یاخود کاری ئــازاد بێت، ئەمجۆرەی باج لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا بە شێوەیەکی سروشتی لە خەڵك وەردەگیرێت.

د- باجــی کڕیــن: پێشــی دەگوترێت باجــی فرۆشــراو، چونکە پیــادە دەکرێت بەســەر کرداری کڕینو فرۆشــتنی کاڵادا، بریتییە لە ڕێژەیەکی سەدی لەسەر نرخی شــمەك دادەنرێــت، لە کاتــی گوێزانەوەی شــمەك لە کارگــەوە بۆ دەســتی بازرگانی کۆ، (ئەوانەی فرۆشــیان بە کۆیە) پاشــان بازرگانە بچووکەکان (ئەوانەی فرۆشیان بە تاکە) دواتر بۆ دەستی بەکارهێنەر.

بنەماو یاساکانی سەپاندنی باج:

١- دادپەروەری: بــە بۆچوونی (ئادەم سمیث) بریتییە: لە بەشداری کردنی تاك لــە خەرجییەکانــی دەوڵەتــدا هەر کەس بەپێی داهاتی خۆی.

٢- ڕوونی باج لە لایەن باجدەرەوە لە ڕووی چەندایەتیو چۆنایەتییەوە، ئەمەش باجــدەر دەپارێزێت لە هەر فێڵو ســتەم لێکردنێك.

٣- دەســت پێوەگرتــن: واتە تێچوونی کۆکردنــەوەی باج کەمتــر بێت لە داهاتی باجەکــە، تــا بتوانرێت زۆرترین ســودی لێوەربگیرێــتو لــە کۆتاییــدا توانــای گەیاندنــی پەیامــی خــۆی هەبێــت وەك دادگەری کۆمەڵایەتیو ...هتد.

# هەشت بنەمای بەڕێوەبردنی کوالێتی

بەشی یەکەم

ئا: ئیبراهیم مستەفا خدر

ئەو بابەتە بە پێی سیستەمی بەڕێوەبردنی کوالێتی Iso ...٩٠و Iso ٢٠٠٠ دارێژراوە، بەڕێوەبەری هەر ڕێکخراو و دامەزراوەیەك دەتوانێت سوود لەو بنەمایانە وەربگرێت، هەر وەك بنچینەو چوارچێوەیەك بۆ ڕێنماییو سەرکردایەتی کردنی دامەزراوەکەی بە مەبەستی چارەسەرکردنی کارەکانو باشتر بەڕێوەبردنی ئەرکەکانیان.

بنەمای یەکەم: گرنگیدان بە کڕیارەکان (Customer Focus)

هەر دامەزراو و ڕێکخراوێك پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەیە بە کڕیارەکانیو دەبێ هەست بە پێداویستییەکانی ئێستاو داهاتوویان بکات، بۆئەوەی بتوانێت پێداویستییەکانیان دابین بکات، لەگەڵ ئەوەشدا دامەزراو بۆ تێپەڕبوونو خۆ ڕزگارکردن لە داواکارییەکانی کڕیارەکان پێویستی بە پلانو کۆشش کردن هەیە. گرنگیدان بە کڕیارەکانو هەست پێکردن بە پێداویستییەکانی ئێستاو داهاتووی ئەوان دەبێتە هۆی وەڵامدانەوەی خێراو ڕاستەوخۆی ڕێکخراو بە دەرفەتەکانی بازاڕو زیادکردنی سوودمەندی خۆیو لە ئەنجامیشدا دەبێتە هۆی زیادکردنی قازانجی پشکەکانو پشکی لە بازاڕ.

ڕازی بوونی کڕیارەکان لەگەڵ زۆربوونی کاریگەری بەکارهێنانی سەرچاوەکانی ڕێکخراو دەبێتە هۆی وەفادار بوونی کڕیارەکان بە بەرهەمو خزمەتگوزارییەکانی، کە ئەوەش دەبێتە هۆی بەردەوام بوونو مانەوە لە بازرگانیو بازاڕی ڕکابەرایەتی.

بەکارهێنانی بنەمای گرنگیدان بە کڕیارەکان بە شێوەیەکی گشتی دەبێتە هۆی ئەنجامدانی ئەم کارانەی خوارەوە:

١- بۆ هەستکردن بە پێداویستییەکانو ناسینەوەیان دەبێ لێکۆڵینەوەی پێویست ئەنجام بدرێت.

٢- دڵنیابوون لە پەیوەندی ئامانجەکانی ڕێکخراو و پێداویستییەکانی کڕیارەکان.

٣- پەیوەندییەکانی ناو ڕێکخراو هەماهەنگ دەکرێت بۆ دابینکردنی پێداویستیو نیازەکانی کڕیارەکان.

٤- پەیوەندی کردن لەگەڵ کڕیارەکان بە شێوەی سیستەمی بەڕێوەبردن ئەنجام دەدرێت.

٥- پێوانەکردنی ڕەزامەندی کڕیارەکانو بڕیاردان لەسەر دەرئەنجامی، لە هەمان کاتدا دەبێ هاوسەنگییەك هەبێت لە نێوان ڕەزامەندی کڕیارەکانو سەرکردەکانی ڕێکخراو، وەك: (بەرپرس، خاوەن ئیمتیازەکان، سەرمایەداران، ئەنجومەنەکانو... هتد).

بنەمای دووەم: سەرکردایەتی لە بەڕێوەبردندا (Leadership):

بەڕێوەبەری ڕێکخراو کە ئاشنایە لە شێوازەکانی بەڕێوەبردن دەبێ بۆ مەبەستەکانی لایەنگیرییەکی هاوسەنگ لە ڕێکخراو دروست بکات لەگەڵ سروشتی ناوخۆی ڕێکخراو، وا دابنێت کە فەرمانبەران بە تەواوی بتوانن بەشداری لە دەستەبەرکردنی ئامانجەکان بکەن. بەڕێوەبردنی ڕێکخراو لەگەڵ ئاشنابوون بە شێوازەکانی دەبێتە هۆی ئەوەی کە فەرمانبەران هەست بە ئامانجەکانی ڕێکخراو بکەن و بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان وردیان بەرزبێت، لەگەڵ ئەوەشدا سەرکردایەتی چالاکییەکان وادەکات کە ڕێکخراو پێوانە بکرێتو لە ڕێگایەکی یەکسان ڕێکبخرێتو بەردەوام بێتو لە ئەنجامدا نەبوونی پەیوەندی نێوان لایەنە جیاوازەکان لە ڕێکخراو کەم دەکرێتەوە.

بەکارهێنانی بنەمای سەرکردایەتی لە ڕێکخراوەکان بە شێوەیەکی گشتی دەبێتە هۆی:

١-ڕەچاوکردنی تەواوی پێداویستیەکانی کرێکارەکان، خاوەنداران، فەرمانبەران، دابینکەران، ئەنجومەنەکانو... هتد.

٢- ئەو ئامانجانە کە بەربەستیان هەیە لە کاتێکی دیاریکراو ڕێکدەخرێت.

٣- بەهای هاوبەشەکان، مۆدیلەکانی کرداری لە تەواوی لایەنەکان دروستو بەهێز دەکرێت.

٤- متمانە دروست دەکرێتو ترس نامێنێت.

٥-فەرمانبەران سەرچاوە پێویستەکانیان هەیە لە فێربوونو ئازادی لە کارکردن، بە هەستکردن بە کارەکانیان چالاکییەکانیان وەڵام دەدەنەوە.

٦- فەرمانبەران بە ئەركو پشکی خۆیان دڵ گەرم دەبن

## کچان و کوڕان لە نێوان ئازار و ئاواتدا

# ماڵئاوا کچان و کوڕان!!

نۆزدە مانگە لە گۆشـەیەکی رەنگیندا لەگەڵ ئێوەی ئازیزدا، لە کەش‌و هەوایەکی هێمـن‌و ئەرخەوانیـدا لەگـەڵ ئـازارو ئاواتەکانتاندا ژیاین‌و زۆرکێشـەو گرفتو دیاردەمان خستە ژێرباس‌و خواسەوە.

پێکەوە سـەبارەت بە دوێنێ‌و ئەمڕۆو ئاینـدەی کچـان‌و کوڕانـی گەنـج‌و لاو گفتوگۆمان کرد.

لە گرفتو کێشـەکان چووینە پێشـەوەو لە نزیکەوە زیاتر ئاشـنای هۆکارەکان بووین، فێربووین بابەتیانە لە کێشەکان بکۆڵینەوەو لـە خۆمانەوە کەس تاوانبـار نەکەین بۆمان دەرکـەوت کە تاوانبـار تەنها لایەك نییە بە تەنهـا، بەڵکو هەرلایـەو چمکێکی گرفتەکان هەڵدەگرن، هەر لە ماڵ‌و قوتابخانەو شەقام‌و دەوڵەتو راگەیاندن‌و دامەزراوەکانی کۆمەڵگای شارستانییەوە تا دەگاتە خودی تاکەکان هەر یەکەو بەرپرسیارێتی خۆی هەیە.

کەواتە بەشـێك لەو بەرپرسیارێتییە دەکەوێتەوە ئەستۆی خۆمان‌و دوای ئەوەی کە ئێمـە بە ئەرکی خۆمان هەڵدەسـتین ئەوسـا بۆمان هەیە لێپرسـینەوە لەگەڵ کەسـانی تردا بکەین‌و بەکەمتەرخەمیان لە قەڵەم بدەین.

چونکە کاتێـك ئێمە خۆمان بە کاری خۆمان هەڵناسـین ئەسـتەمە چاوەڕوانی شتێك لە کەسانی تر بکەین!!

یاخـود کاتێـك خۆمـان لـە پەرش‌و بڵاویدا بژین‌و داوا لە کەسانێکی تر بکەین بەرنامەڕێژیمان بۆ بکەن!!

دەبێت فێربین ئەرکەکانمان جێبەجێ بکەین، پاشان داوای مافەکانمان بکەین!

هەڵبـەت لەم ماوەیـەدا ئەمانەو زۆر شتی دی فێربووین..

لە کاتێکدا هیوادارم سودو کەڵکتان لەم گۆشـەیە وەرگرتبێتو جێگای رەزامەندی ئێوەی ئازیز بووبێت، لە دووەم سـاڵیادی بڕیـاردا دوای پێشکەشـکردنی چەپکـە گوڵـی پیرۆزبایـی، ماڵاواییان لـێ دەکەم داوا لـە ئێـوەی بەڕێز دەکەم کـە لەوڕۆ بەدواوە ئیدی خۆتان درێژە بە نووسـین‌و لێکۆڵینەوە بدەن‌و بە قەڵەمی خۆتان ڕێگای سەرکەوتن‌و پەرەپێدان شەق بکەن.

بۆیە لەم ژمارە بە دواوە دەروازەی ئەم گۆشـەیە دادەخەین، لە گۆشەنیگای نوێدا بە دیداری یەکتر شاد دەبینەوە.

هیـوادارم هەموو سـاتەکانی ژیانتان خۆشی‌و کامەرانی بێت.

## هەناری شیرین

ڕزگار غەریب حەمەلاو

ڕۆژێکیـان خاوەن باخێك باخەوانێکی دەبێت، خـاوەن باخ سـەردانی باخەکەی دەکاتو داوای لێدەکات هەنارێکی شیرینی بۆ بهێنێت تاوەکو بیخوات، ئەویش دەچێت لـە یەکێـك لـە درەختـەکان هەنارێکی بـۆ لێدەکاتـەوەو بۆی دەهێنێـت، کاتێك هەنارەکـە تام دەکات تامەکەی ترشـە، لە کاتێکـدا ئـەو داوای هەنارێکی شـیرینی کردبـوو، دووبـارە داوای لێ دەکات بچێت هەنارێکی شـیرینی بۆ بهێنێت، بە هەمان شـێوە هەنارێکی ترش دەهێنێت. بەسـەر سوڕمانەوە خاوەن باخەکە پێی دەڵێت: تۆ بۆ ماوەی سـێ سـاڵە لەم باخە کاردەکەی تاوەکـو ئێسـتا نەتزانیـوە کام دار هەنار شیرینەو کامیان ترشە؟

باخەوانەکـەش دەڵێت: قوربان تۆ بە منت گوت خزمەتـی باخەکە بکە نەوەکو بەرهەمەکەی بخۆم.

خاوەنەکـەی بـەم هەڵوێسـتەی باخەوانەکەی سەرسـام بوو لە دەستپاکی‌و رەوشـتی بـەرزی، بۆیـە بڕیاریـدا کچە تاقانەکەی خۆی پێشـکەش بکات، ئەویش بـەم بڕیـارە زۆر دڵخۆش بوو، سوپاسـی خودای کردو داواکەی پەسەند کرد.

سەرچاوە/ ماڵپەری طارق سویدان.

و/ درەخشان بەهادین محەممەد

# بۆ نیازی ئاو خواردنەوە تەنها دەبێت ئاو بخۆیتەوە!!

لاوێك لە كارەكەیدا دووچاری گرفتێك ببوو. بەرەو شارێكی دوور بەرێكەوت، لە رێگەدا بەردەوام بیری لەوە دەكردەوە كە چۆن گرێی كارەكەی بكاتەوە؟! چەند رێگا چارەیەك دەهات بە خەیاڵیدا، بەڵام بەڕاستی تیامابوو كەچی بكات، بەدەم ئەم بیركردنەوەیە بۆ خواردنی ژەمە نانێك چووە چێشتخانەیەك، لەوێ پیاوێكی پیری سەرناس لاوەكەی بینیو پێی گوت: ئەی لاو بیر لەچی دەكەیتەوە؟ لاوەكە كە ئەو كاتە تەنها ئاتاجی دوو گوێ بوو كە گوێ بداتە دەردی گرفتاری ئەو، بۆیە یەكسەر گرفتی خۆی بۆ پیرەپیاو باسكرد، سەیربوو پیرە پیاوەكە دوای گوێگرتن لە گرفتی لاوەكە دەستی كرد بە پێكەنین! لاوەكە بەسەرسوڕمانێكەوە لێی پرسی: بە گرفتێكی وەها گەورە پێدەكەنی یان بە بێ چارەیی من؟! پیرەكە هەروا بەدەم پێكەنینەوە وتی: «بە دەستەوساني و بێ ئەزمونی تۆ»، بەردەوام بوو: ئەم ئامۆژگارییە لە من ببیستەو تاكۆتایی تەمەنت لە بیری مەكە.

لاوەكە بە تامەزرۆییەوە گوێی لە قسەكانی پیاوەكە گرتبوو، سەری راوەشاندو وتی: بە دڵنیاییەوە، پیرە پیاوەكە بە زەردەخەنەیەك كە بەسەر لێوییەوە بوو وتی: «لەم دونیایەدا تەنها مردن چارەی نییە». دەستی برد بۆ ئەو پەرداخە ئاوەی كە لەبەرامبەرییەوە لەسەر مێزەكە دانرابوو، قوم قوم خواردییەوەو بەسەرنجەوە سەیرێكی لاوەكەی كرد.

كاتێ ئاوی پەرداخەكە تەواو بوو رووی كردە لاوەكەو وتی: «بۆ نیازی ئاو خواردنەوە تەنها دەبێت ئاو بخۆیتەوە»

نە ئەوەی ماوەیەكی زۆر بیر لە چۆنیەتی ئاوخواردنەوەكە بكەیتەوە!

لاوەكە چوو بە خەیاڵداو بەرەو شارەكەی بە رێكەوت، چونكە تێگەیشتبوو كە بۆ نەهێشتنی گرفتەكەی تەنها دەبێت چاكترین رێگاچارە كە دەمەودەست هاتبوو بە خەیاڵیا یەكسەر جێبەجێ بكات.

بەڵێ ئازیزان ئەگەر سەرەڕای بەشداری كردن لە خولو ناوەندی جیاوازو خوێندنەوەی كتێب گەلی زۆر لە بواری سەركەوتندا، هەروا نائومێد ماوی، بێگومان چیرۆكی سەرەوە هەر بۆتۆش بەو جۆرەیە، بۆ چارەسەركردنی گرفتەكان «گەشتن بە سەركەوتن» تەنها دەبێت دوای دۆزینەوەی رێگاچارە (زیادبوونی زانستو تێگەیشتن) دەستبەجێ بخرێتە بواری جێبەجێكردنەوە، گرفتی سەرەكی ئەوەیە كە تەنها بیر لە گرفتەكە دەكەینەوە، لە هەڵبژاردنی چاكترین رێگا چارەو بە تەواوی هێزودەست بەبێ ئەنجام دانی بێ ئاگاینو تەنها بیر لە گرفتەكە دەكەینەوەو بە دەوری خۆماندا دەسوڕێینەوە!

خوومان گرتووە بە خووەكانمانەوە...!

ئایا دوای بەشداری كردن لە خولو خوێندنەوەی كتێب، خووەكانمان بە لاوە ناوەو رێگا پێشنیار كراوەكانی كتێبو مامۆستاكان جێبەجێ دەكەین؟!

ئایا بۆ ئەنجامدانی یان نەدانی ئەو كارەوەیت؟!... ئەگەر كارێك راستەو دەبێت ئەنجام بدرێت تەنها ئەنجامی بدە. رێگاكانی سەركەوتن وەكو ئاوخواردنەوە، سادەو ئاسانە.

سەرچاوە: راه موفقیت ژ/ ٥.

# فرمێسکەکان لەگەڵ بڕیاردا

م/ عەبدولدائیم هەورامانی
مامۆستای زانکۆ

پارساڵو لەم حەلەدا بۆ ساڵیادی بڕیار نووکی خامەم سۆزێکی بۆ بڕیار چڕی، کەمێك لە خزمەت بابەتەکانیدا وەستامو لە ژێر سێبەری تەرزی سەرباسەکان هەناسەیەکم هەڵمژی··· وەلێ ئەمساڵ ئەوانە هەموو بۆ قەڵەمە جوانو ناسکەکانی خوێنەرانی بڕیار بەجێ دێڵمو تەنها باسی لایەنێکی گرنگی بڕیار دەکەم، ئەویش ئەو فرمێسکە گەرمانەیە کە دڵە سۆزدارەکانی جۆشداو لەگەڵ ئەو بابەتانە دەژیم گەوهەرەکان لە چاو هەڵدەوەرێنیو دەریایەك لە میهرەبانی بۆ پیرەکان فەراهەم دێنیو هام غەمییەك لەگەڵ هەژارو بێنەواو هەتیوەکان دروست دەکات···

لە ڕاستیدا بڕیار لەگەڵ ئەوەدا بەهرەمەندت دەکات لە بوارە ماددیەکانداو دەمێ فێرت دەکات دامەزراوەکەت چۆن پێش دەخەیتو ساتێ باسی کۆبوونەوەو کەمێ چۆن سامان جەم دەکەیتو سەرەتایەك بۆ زانستی ڕێکخستن لە زەیندا دەنەخشێنیو ژیان لەگەڵ هاوسەرت چۆن دەگوزەرێنیو چۆن دەخوێنییەوەو··· لە زۆر بواری تر بەهرەکانی مرۆڤایەتی وەگەڕ دەخا··· لایەنی شۆردنی دڵەکانی بە گریانی هامسۆزی غافڵ نەکردووەو لە نێو ئەو جەنگەڵستانی ماددی گەراییەدا بابەت گەلێکی نووسیوە کە هاوەڵی بارانی چاوەکان بوون، بۆیە لەم بابەتەدا ڕوو دەکەمە بڕیارو دەڵێم: بڕیار تۆ لەگەڵ پیرەکان ئێمەت کردە هاوڕاو لە کەناری دەریاوە دەریایەك فرمێسکت کردە قوربانی ئەو پیرەدایکە بە ساڵاچووەی لە چاوەڕوانی کوڕەکەیدا گیانی سپارد·

ئەی تۆ نەبووی بەدەم سڕینی ئەشکەوە گوتت: بزانن جوانتر لە ژیان دایکەو ئازاری ویژدانت خرۆشاندو بۆ کەمتەرخەمیمان لە خزمەت باوکەکاندا قەیرێك لە بەردەم بارانی گریانماندا وەستاین، تا کوچەو کۆڵانی ئێشەکانی دەروونمانی شۆردەوە، بەڵکە ئەمە کەفارەتی ڕۆژانی بێگوێیی باوکانمان بێت·

دەستی گەنجو مێردمنداڵەکانت گرتو فێرت کردن بەخشین تەنها پارە نییەو هەندێجار تەنها خەندەیەك شیرینترین هیوا بە بەرامبەرە پیرەکان دەبەخشێ، بڕیارت پێدان کە هەشت درۆکەی دایکیان لە یاد نەکەنو ئاوازێك لە درۆ بەسۆزو پڕ میهرەکانی دایکان بهۆننەوەو بۆ سوودمەند بوون لەو هەستە دایکانەیەی کە هەست بە ئازار ناکات لە بەرامبەر دڵخۆشکردنو پەروەردەکردنی ڕۆڵەکانیدا·

ڕۆڵەکانت فێرکرد بۆ دایکە میهرەبانەکەیان دڵۆپێك لە دەریای فرمێسکی ئەمەكو پێزانین بکەنە پەخشانو پەخشی بکەن لەبەر پێی دایکیانداو دەوارێك لەو گوزەرە هەڵبدەنو لە بەهەشتدا ئۆقرە بگرن·

دەستی مامۆستای قوتابخانەکانت گرتو پێت گوتن بۆ خوێندکارەکان بە ڕاستی ببنە دایكو هەستێك لە دەروونی منداڵە بێ دایکەکاندا دروست بکەن بە جۆرێ بۆنی دایکیان بگرن تا بەوپەڕی دڵنیاییەوە پێتان بڵێن: بۆنی تۆ ئەمڕۆ لە بۆنی دایکم دەچێت!

بەرامبەر منداڵە دڵناسكو بێگەردەکان کە دەیانەوێ خۆشەویستیان بۆ ئێمە دەرببڕنو هەڵە جوانەکانیان دەکەنە خەڵاتمان سەرمان نەوی کردو لەبەردەم هەڵەکانمان بڕیارماندا ئیتر مۆمەکانیان بە فرمێسکمان نەکوژێنینەوەو بۆ دڵە سورەکان کە بە دایەگیان خۆشم دەوێیت نەقش کراوە چوارچێوەیەکی زێڕین دروست بکەینو بۆ ڕووشانی سەیارەك بە مانشێتی بابەگیان خۆشم دەوێیت دەستی جگەرگۆشەکانمان بە برین نەبەین·

لەگەڵ شادییەکانی مینۆی کەم ئەقڵ گریان سنگی بەرنەدەداینو بە ئەسپایی بڕیار دەیگوت ئاخر کەم ئەقڵەکانیش هەستیان هەیە هەستتان هەبێ·

لەگەڵ بێ باوك و منداڵە بێنازو دڵ شکاوەکان ئێمەت کردە هاوەڵو جانتای هەتیوێکمان ماچ کرد کە پڕ بوو لە پاشماوەی لەفەی قوتابییەکانی هاوەڵیو بە خۆشحاڵییەوە بۆ براو خوشکە خنجیلە هەژارەکانی دەکردە دیاری·

ئێمەت بردەوە بۆ هەڵەبجەی شەهیدو لەگەڵ خەمەکانی منداڵێکی ئەو شارەدا ئێمەت کردە هاوسێو بە چەندین ئەسرین بووینە هاوڕێی خەمەکانیو لەگەڵیدا بە دوای تاوانباردا گەڕیدە بووین···

ئەمە گوزەرێکی پڕ گریانی ساڵێکی عومرم بوو لەگەڵ بڕیار، تۆ بڵێی چەند بابەتی تری بڕیاریش ببێت کە دڵی ڕەقی من نەیتوانی بێت بگریو ئێوەی بە هەست فرمێسکتان بۆ هەڵڕشتبێت؟!

بە ستافی بەڕێزی بڕیار دەڵێم: لە یادتان نەچێت، پیرەکان، بێ باوكو هەژارەکان لەم زەمەنی بێ نەواییەدا، لەم دەوڵەتی بورجوازییەدا، دەستی نەرمی بەزەییو میهرەبانی گەرەکە، زریانێك گریانیان بۆ هەڵکێشانی ڕیشەی زوڵمو ستەم دەوێ··· بەردەوامیتان لەم جۆرە بابەتانە دەریایەك خۆشەویستی ئەپژێنێ، سایەیەك بۆ بێنەوایان لە دڵەکاندا دەڕوێنێ، ئەشکەوتێك بۆ کاتی کۆچی هەژاران لە دڵماندا دەسازێنێ، چەندین دڵی بێ هەستی قاڵ بە دونیاوە ڕادەچەنێنیو تۆزێ تۆزی زەمەنی قڕیو پڕی دەتەکێنیو··· گەوهەرەکان زەنگوڵ زەنگوڵ لە چاوانمان دەبارێنێ···

## پەی دووەم ساڵ
## یادو گۆڤارو بڕیاری

بڕیار مەگەزین نیات هاوشێوە
سەنگینو ڕەنگین هەردویشا پێوە
بەوادێوە کەم ڕای وێت کەردەوە
گرەوی ساحەی دڵت بەردەوە
دڵ بە دڵ وەستی یانە بە یانە
کەم یانە بێ تۆن ئی کوردستانە
خەرمانو ڕەنجو دەروون پاکانی
جە ڕاسۆ ئامای وە ڕاس لوانی
دڵی بێ هیوات پەڕ کەردەن هیوا
کاسەو ئومێدی سا لێواو لێوا
بڕیار، بێ بڕیار، بی خاوەن بڕیار
لازمەن گرکەس تۆ کەرۆ وەیار
کارنامە پەی کار، کارمەند پەی کاری
چەنی مەعریفەو پاکو ڕۆژگاری
پلان ڕێژ کەردەن نزیك تا وەدوور
ڕاگەی تەعلیمو پەروەردەی زەروور
ئیرادەتو ستۆ دڵەو هەژارا
دەوڵەمەن بەخشاش قەرزو قەرزارا
هەژارو نەدار بێ دەسو قەرزار
دەوڵەمەن ژیوا جە سایەی بڕیار
ئەو دڵ ئیقبالشەن تۆ وەلاش یاوی با
تەوەنێ بۆ مەبۆ بە ئاوی
موبارەکت بۆ ساڵ یادی تەمەن
وەشەسیاکەم خاترەت جەمەن

ئازاد محێدین محەممەد/ خورماڵ

## بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

بەڕێزان/ سەرجەم ستافی گۆڤاری بڕیار، سەلامی خوای پەروەردگار لە هەمووتان، دەخوازم هەمیشە شادو کامەران بن.

لەم زەمانی پێشکەوتنو گەشەکردنی تەکنەلۆژیا نوێیەدا، پێویستە عەقڵو ڕۆشنبیری جەماوەر گەشە بکاتو چەقبەستوو نەبێت، ئەویش بە لە ئامێزگرتنو خوێندنەوەو جێبەجێکردنی ناوەڕۆکی بڕیار دەبێت، بەڵام کام بڕیار؟! بڕیار زۆرن بێ شومارن ناوەڕۆك وەك زەهری مارن، بڕیارە بریقەدارەکان ناڵێم کە لە دەروونو ویژدانێکی مردووەوە دەردەچن. بۆیە هیچ کاریگەرییەکیان لەسەر کۆمەڵگە نابێتو گۆڕانکاریی دروست ناکەن لەم دنیا جەنجاڵو کەس لە کەسەدا پێویستی جەماوەر بۆ بڕیار وەك پێویستی ئاو وایە بۆ ماسی.

ئومێدەوارم کانیاوێك بێت بۆ تینوانی ڕێگەی ئازادیو بەختەوەریو پێشکەوتنی شارستانی.

بژی ئەو کەسانەو ئەو عەقڵانەی بڕیاری دەرچوونی گۆڤاری بڕیاریان دا، بەهێزو سپی بن ئەو دەستو پەنجانەی واژۆیان لەسەر کرد.

### بڕیار

بەڕێوەبردن هەم ڕێکخستنە
کارو کارگێڕی و توێشوو خستنە
گەشەپێدانە بە عەقڵی مرۆڤ
تا لەژیاندا نەکا ئاخو ئۆف
پەروەردەکاری نەوەی دوا ڕۆژە
بۆ خۆر دەڕوانێ وەك گوڵەبەڕۆژە
دووەم ساڵیادی بڕیار پیرۆز بێ
ڕێگەی ڕزگاری گشت گەلو هۆز بێ

سالم ئەحمەد مستەفا

## بۆ ئازیزان و
## خۆشەویستانم
## ستافی گۆڤاری بڕیار

### سڵاوی ئەمەكو ڕێزو وەفا

لە دونیای پڕ جەنجاڵیدا دەگەڕام تا گۆڤارێك ببینمەوە لەم کوردستانەدا کە ڕازاوەو قەشەنگو بە نرخ بێت لە ڕووی نەخشەو ناوەڕۆکەوە، پاش تێپەڕبوونی چەندەها ڕۆژو مانگ لە ناکاو بە دەستم کەوت، بینیم ناوی بڕیارە هەر لە سەرەتاوە هەستم کرد بڕیار بۆ من نامۆ نییە، دەستم کرد بە خوێندنەوەی لە بەرگەوە بۆ بەرگ، پاشان لە پێشانگای نێودەوڵەتی چوارەمی پەرتووك لە هەولێر ساڵی ٢٠٠٩، چاوم کەوت بە کاك محمد هاشم، هەستم کرد لەگەڵ ئەویش نامۆنیمو ئەوەندەی تر بڕیارم خۆشویست.

ئێستا بڕیار بۆ من بۆتە ئەندامی پێنجەمی خێزانە ئاسوودەکەمان، هەموو مانگێك چاوەڕێی دەرکەوتنی تریفەی زیوینی مانگە شەوی بڕیار دەکەین، هەموو ئەندامانی خێزانەکەم بڕیاریان خۆش دەوێتو گەر مانگێك درەنگ بە دەستمان بگات ئەوا هەموو دلگران دەبین، وەك چۆن ئەندامێکی خێزانەکەمان بزر بوو بێت.

ببورن کە خامەی نووسینی من کولەو بێ بڕشتە، بەڵام هەر حەزم کرد بەم چەند وشەیە دەستخۆشی ئەم کارە مەزنەتان لێ بکەمو هیوای سەرکەوتنی بەردەوامتان بۆ دەخوازم هەر شادو سەرفرازبن.

دڵسۆزتان:د.جەلال علی جلال
مامۆستا لە
زانکۆی هەولێری پزیشکی

# بەختەوەری لە ناختدایە!

ئا: بێکەرد فارس

ئایا هیچت دەربارەی چیرۆکی کێلگەی ئەڵماسەکە بیستووە؟

ڕووداوەکانی ئەم چیرۆکە باس لە جوتیارێکی خاوەن تواناو چوستوچالاك دەکات، کە چەندین ساڵ لە کێلگەکەیدا زۆر بەگەرموگوڕییەوە کاری تێدا دەکرد، تا ئەو کاتەی بە ساڵاچوو، ڕۆژێك بیستی جوتیارەکان بۆ گەڕان بە دوای ئەڵماسو دۆزینەوەی بۆ شوێنی دوورو دیاریکراو گەشت دەکەن، هەر کەسێك دەستی بخات دەبێتە کەسێکی دەوڵەمەندو بەختەوەری باڵی بە سەردا دەکێشێتو گوزەرانی بە شێوەیەکی باش دەگۆڕێتو بۆ دواجار ماڵاوایی لە هەژاریی دەکات، ئەمە بووە هۆی ئەوەی بیرۆکەی گەشت کردنو گەڕان بەدوای ئەڵماسدا بۆ دروست ببێت، هەربۆیە بڕیاری دا کێلگەکەی کە چەندین ساڵو بەوپەڕی چالاکیو دڵسۆزییەوە کاری تیاکردووە بفرۆشێت، چونکە بە بۆچوونی ئەو ئیدی بەختەوەری لەوێدا بەدی ناکاتو بۆ گەڕان بەدوایدا پێویستە بیر لە دەستکەوتنی ئەڵماس بکاتەوە، تا ببێتە کەسێکی دەوڵەمەندو بگاتە ئەو بەختەوەرییەی کە بە دوویدا وێڵە.

کاکی جوتیار کێلگەکەی فرۆشتو گەشتی گەڕانی دەست پێکرد، بۆماوەی سیازدە ساڵ سەرقاڵ بوو بە دۆزینەوەی ئەڵماس، بەڵام نەیتوانی هیچ ئەڵماسێك بدۆزێتەوەو هەموو هەوڵەکانی لەو ماوە زۆرەدا شکستیان هێنا، تا گەیشتە ڕادەی بێهیوایی، چونکە نەیتوانی خەونەکەی بهێنێتەدی... دەستەوسان بوو، هیچی پێنەکرا، جگە لە بێ هیوایی و نا ئومێدی شتێکی دی هاوڕێی نەبوو لە ژیاندا!

ئەو جوتیارەش کە کێلگەکەی ئەوی کڕی کاری لەسەر دەکردو زۆر بە خۆشحاڵیو چالاکییەوە لەسەر کارەکەی بەردەوام بوو، هەڵدەسا بە بژارکردنو لێکردنەوەی گژوگیای زیانبەخشو دڕكو داڵەکانی ناو کێلگەکەو چاندنی نەمامی نوێو ئاودانیو پەروەردەکردنیان بە باشترین شێوە، لەو ماوەیەدا کێلگەکەی بووە باشترینو پڕ بەرهەمترین کێلگەی ئەو ناوچەیە لە ڕووی باشیو جۆری بەرهەمەوە!

ڕۆژێك کاری لە کێلگەکەیدا دەکرد شتێکی بینی دەبریسکایەوە، کاتێ هەڵیگرتو لێی ڕووانی بۆی دەرکەوت پارچەیەك ئەڵماسی بچووکە! زۆرخۆشحاڵ بوو بە پەرۆشەوە دەستی کرد بە زیاتر گەڕانو پشکنین بە دوای ئەڵماسدا، توانی پارچەیەکی تریش بدۆزێتەوە، تا گەیشتە ئەوەی پارچەی سێیەمو چوارەمیشی دۆزییەوە.

ئەوەی تووشی سەرسوڕمانی کرد ئەوە بوو، بۆی دەرکەوت کە لەژێر کێلگەکەدا کانێکی ئەڵماس هەیە!!

لەم چیرۆکەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە بەختەوەری زۆر نزیکە لێمانەوە، پێویست بەوە ناکات لە شوێنی دوور بەدوایدا بگەڕێین، چونکە لە ناخی خۆماندایە!!

لە ناخو ناوەڕۆکی هەریەکێکماندا کێلگەیەك هەیە بۆ چنینەوەی بەرهەمی ئاسوودەییو بەختەوەری، پێویستە گرنگی پێ بدەینو بژاری گژوگیاو نەمامی زیانبەخشو دڕکەکانی بکەینو ئاودێری بکرێت تا بتوانین لە کاتی گەڕان بەدوایدا بەرهەمێکی باشو بە کەڵك بچنینەوە، کە بریتییە لە سەرکەوتنو بەختەوەری.

ئەگەر هاتوو ئەو کێلگەیەی ناخمان بێبەش بێت لە ئاودانو پڕ دڕکوداڵ بێتو گیای زیانبەخش زاڵ بێت تیایدا، ئەوا بێگومان بەرهەمێکی بێکەڵکمان چنگ دەکەوێ، ئەمەش خۆی لە خۆیدا شکستی کارەکان دەگەیەنێت.

ئەگەر بە جۆریکی تر ئاماژەی پێ بدەینو زیاتر ڕوونی بکەینەوە، دڕكو داڵو گیا زیانبەخشەکانی ناو کێلگەکە بریتی بێت لە بیرۆکەی نەرێنیو ڕەشبینیو بێ هیوایی، ئەوا هەرگیز ناتوانرێت هەستین بە دوورینەوەو بە دەست هێنانی ئاسوودەییو بەختەوەری، چونکە ئەم ڕێگایە زۆر کاریگەری نەرێنی دەبێت لەسەر بیرکردنەوەو شێوازی ژیان، بەڵام ئەگەر توانیمان هەڵسین بە لابردنی هەموو ئەو دڕکوداڵانەو لە بەرامبەردا سەرقاڵی چاندنی نەمامی نوێ بین، (بیرۆکەی ئەرێنیو گەشبینیو هیوا) لە جێی ئەواندا، بێگومان ئەو کێلگەیەی کە لە ناخماندایە دەبێتە سەرچاوەیەك بۆ هەڵقوڵانو بەرهەمی ئاسوودەییو بەختەوەری.

کەواتە هیچ پێویست ناکات وێڵ بین بە دوای بەختەوەریدا لە شوێنە دوورەکان، بە بیانووی ئەوەی شوێنەکەی خۆمان هیچ هۆکارێکی تێدا بە دی ناکرێو ناتوانی ئارام بگری لەسەر ناڕەحەتییەکانی، ئەوەی کە پێویست بە گۆڕان دەکات خودی خۆمانو بیرکردنەوەکانمانە، نەوەك ئەو شوێنەی کە لێی دەژین!

کەوایە ئیتر دوور مەڕۆ لە ناخی خۆتدا بۆی بگەڕێ...

و/ هەردی ئەنوەر

# خۆشیو شادی ئاڵۆز مەکەن!

جارێکیان چیرۆکی نووسەرێکی بەناو بانگم خوێندەوە کە بەم شێوە بوو:

پاشاییەك نەخۆش کەوتو کەس لە نەخۆشییەکەی سەری دەرنەدەکرد. هەستی بەدبەختیو رەشبینی بە تەواوی دڵو دەروونی پاشای داگیر کردبوو، بۆ رزگار بوون لەم دەردە، بەردەوام بیری لە چارەسەرێك دەکردەوە، پاشان رایگەیاند: نیوەی موڵکەکەی خۆم دەدەم بەو کەسەی کە بتوانێت چارەسەرم بکات. هەموو داناو زانای ئەو شارە کۆبوونەوە تا بزانن چۆن دەردی پاشا چارەسەر بکەن، بەڵام هیچ کامیان چارەییەکیان نەدۆزییەوە.

لە کۆتاییدا یەکێکیان وتی: مـن دەتوانم پاشا چارەسەر بکەم، دەبێ کەسێکی خۆشبەخت بدۆزنەوە، جلەکانی لێ بسەنو بیکەنە بەری پاشا، بەم شێوەیە پاشا چارەسەر دەبێت. پاشا داروودەستەکەی نارد بۆ دۆزینەوەی کابرایەکی خۆشبەخت، ئەوانیش تەواوی وڵات گەران، بەڵام نەیانتوانی کەسێکی خۆشبەختو کامەران بدۆزنەوە، تەنانەت کەسێکیشیان نەدۆزییەوە کە بە تەواوی دڵخۆشو سەرکەوتوو بێت. ئەوەی کە دەوڵەمەند بوو، هاوسەرێکو ژیانێکی ناخۆشی هەبوو. ئەوەی کە منداڵی هەبوو، منداڵەکانی رێکو تەبا نەبوون، بە کورتی هەر یەك لە شتێك گلەییان هەبوو.

لە کۆتایی شەودا، کوڕی پاشا کە لە تەنیشت کوخێکەوە رەتبوو، گوێی لە دەنگی کەسێك بوو دەیگوت: سوپاس بۆ خوا کە کارەکەم تەواو کرد، نانم خواردو دەتوانم بە ئیسراحەت رابکشێمو بخەوم. ئیتر چیم دەوێ هەمبێ..

کوڕی پاشا زۆر دڵخۆش بوو، فەرمانیدا کە جلەکانی پیاوەکە بهێننو بیبەنە لای پاشا، پیاوەکە هەرچییەکی ویست بیدەنێ. داروودەستەی پاشا بۆ بردنی جلەکانی پیاوەکە چوون بۆ کوخەکە... بەڵام ئەو پیاوە خۆشبەختو کامەرانە جلی نەبوو!!

بەڕای ئێوە بۆ خۆشیو کامەرانی دەبێ هەندێ توانای تایبەتی هەبێ؟! ئەگەر ئێوە چاوەڕوانن کە هەموو شتێکتان بۆ بڕەخسێ تاکو هەست بە خۆشیو کامەرانی بکەن هیچ کات پێی ناگەن. خۆشبەختی لەو کاتانەدایە کە سات لە دوای سات لە نێوان پەنجەکانماندا دێنو دەڕۆن (بە بێ ئاگابوون). لەو ژیانەی کە هەتانە چێژ وەرگرن، لە کاروبارتان، لە هاوسەرانتان، لە دۆستانو هاوڕێیانتان، دەتوانی زۆر بە ئاسانی لە هەموو شت چێژ وەربگری، تکا دەکەم خۆشیو شادی ئاڵۆز مەکەن!!!

سەرچاوە" مجله موفقیت ژمارە١٧٧ ١٠٠٩١٠٠

هەڵمەت فوئاد

# پاشایەك

رۆژێك پاشایەك دەستیکرد بە گەشتێکی وشکانی دووردرێژ...دوای گەڕانەوەی لە گەشتەکە..

بینی پێیەکانی بریندارو شەکەت بووەو بە هۆی زۆر رێکردنییەوە بە پێ خاوسی.

لەبەرئەوە فەرمانێکی دەرکرد کە دەبێت تەواوی رێگاوبانی وڵاتەکەی بە پێستەی ئاژەڵ داپۆشرێت، بۆئەوەی چیتر دووچاری وەها برینێك نەبێتەوە.

بەڵام یەکێك لە راوێژکارەکانی پێشنیارێکی باشتری خستە بەردەم پاشا، ئەویش دانانی تەنها پارچەیەك پێست لە ژێر پێیەکانی پاشا لە بری ئەوەی تەواوی وڵات پێست رێژ بکرێت!

ئەگەر دەتەوێ بەختەوەر بژیت لەم جیهانەدا هەرگیز سەرەتا هەوڵی گۆڕینی مەدە چونکە مەحاڵە، بەڵکو گۆڕانکاری لە خۆتدا بەرپابکە، پاشان هەوڵی گۆڕینی ئەویش بدە!

ئینتەرنێت/ www.jojo.com

# چۆن پسپۆڕیت لە زانکۆدا دیاری دەکەیت؟

و/ بەهمەن لەتیف فەتحوڵڵا

هەرگیز لە منداڵیدا بیرت نەکردۆتەوە ببیتە پزیشکێکی ناودار، مامۆستا یان ئەفسەرێکی پۆلیس؟

بەڵام ئێستا کە گەورە بوویتو ژیانی منداڵیت بەجێهێشت، ئایا ناتەوێت ببیتە یاریزانێکی بە ناوبانگ، زانایەکی شوێنەوار، یان ژمێریارێکی لێهاتوو؟

یان ماوەیەکی زۆرە بیرت لەم بابەتە نەکردۆتەوە؟

هاوڕێکەم، ئەگەر ئێستا لە ئانو ساتی کۆتایی هێنانی ئامادەییدایتو هەنگاو بەرەو زانکۆ دەنێیت، پێویستە لە ئێستاوە بیر لەو کۆلیژە بکەیتەوەو دیاری بکەیت کە ئارەزووی دەکەیت، تا هەوڵی بۆ بدەیت.

ئەم بابەتە یارمەتیدەرت دەبێت بۆ دیاریکردنی خاڵە بەهێزەکانت تا بتوانیت بواری پسپۆڕیت لە زانکۆدا دیاری بکەیت.

**بادەست بەکاربین:**

پلاندانان بۆ زانکۆ بەشێکی گرنگە لە پلاندانان بۆ ئایندەت، پێویستە ئەو بەشە دیاری بکەیت کە دەتەوێت پسپۆڕی تیا وەربگریت تاوەکو لە داهاتوودا بە شێوەیەکی زانستیو پیشەوەریانە خزمەت بە خۆتو گەلو نیشتیمانەکەت بکەیت.

سەرەتا هەندێك پرسیار ئاراستەی ناخی خۆت بکە:

* ئایا ئارەزووی کارکردن لەگەڵ منداڵاندا دەکەم؟

* ئایا ئارەزووی نووسینی چیرۆك دەکەم؟

* ئایا ئارەزووی شیکاری پرسیارە بیرکارییەکان دەکەم؟

* یان ئارەزووی بنیاتنانو دامەزراندن دەکەم؟

* ئایا کۆمپیوتەرو پڕۆگرامسازی چێژم پێ دەبەخشن؟

ئایا ئارەزووی نواندنو شانۆگەری دەکەم؟

زۆر گرنگە ئەو کارانە دیاری بکەیت کە چێژت پێ دەبەخشنو جیای بکەیتەوە لەو کارانەی بێزارت دەکەن.

لەوانەیە بزە بێتە سەر لێوانت کاتێك بیر لە ڕاپەڕاندنی کارێك دەکەیتەوە، بەشێوەیەکی پیشەوەری یان دەموچاوت گرژ دەبێتو دەڵێیت هەرگیز ناتوانم ئەو کارە بکەم.

پرسیارێکی بەجێ، چۆن دەتوانم بزانم ئارەزووی چی دەکەمو لە چیدا سەرکەوتوو دەبم؟

زۆر باشە، چەند هەنگاوێکی سادەو ساکار هەیە یارمەتیدەرت دەبێت تا زیاتر خۆت بناسیت.

ئاوەستەیەك (ترکیز) بکە:

هەنگاوی یەکەم: ئاوەستەیەك بکەو لیستێك بنووسە لە بەهرەکانت، تایبەتمەندییەکانتو ئەو کارانەی گرنگیان پێدەدەیت.

قەڵەمو کاغەزێك هەلگرەو لە ژوورێکی هێمندا دابنیشە، لە سەرەوەی پەڕەکەدا ناوی خۆت بنووسە، پاشان لیستێك بنووسە لەو کارانەی گرنگیان پێدەدەیت، بەهرەکانت، ئایدۆلۆژیات، هەروەها تایبەتمەندییە کەسایەتییەکانت.

بێگومان ئەم کارە هەندێك کات لە تۆ دەبات، باشتر وایە بە ڕاستگۆییو سەربەستییەکی تەواوەوە سەرجەم ئەو شتانە بنووسیت کە دەربارەی خۆت دەیزانیت.

گرنگەکان: ئارەزووەکانت (هیوایەت)؟ ئارەزووی چ کارێك دەکەیت؟ ئارەزووی چ وانەو بابەتێك دەکەیت؟ چ جۆرە کتێبێك دەخوێنیتەوە؟ ئەو گۆڤارو بڵاوکراوانە کامانەن دەیانخوێنیتەوەو هەوڵی دەستکەوتنی دەدەیت؟

بەهرەکان: لەوانەیە هەندێك کار هەبێت بەشێوەیەکی سروشتی (خواکرد) توانای جێبەجێکردنیت باش بێت، بۆ نموونە پێدەچێت لە بیرکاری، وێنەکێشان، نووسین یان شیعرو هۆنراوەدا بەهرەیەکت هەبێتو توانادار بیت.

کەواتە بابزانین ئەو کارانە چین کە هەست دەکەیت بۆ تۆ ئاسانو چێژبەخشە لە کاتێکدا کەسانی تر بە ئاڵۆزو قورسی دەزانن؟

با خاڵە بەهێزو لاوازەکانت دەستنیشان بکەین، لەوانەیە زانیارییەکی باشت هەبێت دەربارەی بەرنامەکانی کۆمپیوتەر، یان توانای بەستنی پاسکیلێکت هەبێت بە یەکجار سەیر کردنی کەتەلۆکەکەی.

ئایدۆلۆژیا: بیرکردنەوەت دەربارەی ژیان چۆنە؟ چ شتێك لە ژیاندا بۆ لای خۆی کێشت دەکات؟ ئایا تۆ دژی تایەفەگەریو ڕەگەزپەرستیت؟ داکۆکیکاری مافەکانی

مرۆڤیت؟ پابەندیت بە دینەوەو ئارەزووی چالاکییە ئاینییەکان دەکەیت؟ یان تۆ کەسێکیت گرنگی بە سەروەتو سامان دەدەیتو پارە ئامانجێکی گەورەی ژیانتە؟

کەسایەتی: کەسایەتیت دیاری بکە، ئایا تۆ کەسێکی هێمنیتو ئارەزوو دەکەیت لە کوچێکدا بە تەنها کار بکەیت؟ ئایا بێزاریت لە پابەندیو ئارەزوو دەکەیت زۆربەی کاتەکانت سەربەست بیت؟ ئایا چێژ لە گفتوگۆکردن لەگەڵ خەڵکیدا دەبینیت یان کەسێکی گۆشەگیریو حەز بە تەنهایی دەکەیت؟

ئایا ئارەزووی زانینی وردەکارییەکان دەکەیتو ناتوانیت لە پرسیار کردن بووەستیت؟ کەسێکی بە بەزەییت بەرامبەر ئاژەڵو منداڵە ناکامەکان؟ بیر بکەرەوە بزانە هاوڕێکانت بە چ شێوازێك باست دەکەن؟ ئایا کەسێکی ئارامگریت، میهرەبانیت، خاوەن پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی باشیت؟

بالیستەکەت گشتگیرو راستگۆ بێت بە پێی توانا.

لێکدانەوە:

هەنگاوی دووەم: لیستەکەت شیکار بکە:

ئێستا لیستەکەت ئامادەیە، بە وردیو هێواشی بیخوێنەرەوە، لەسەر لاپەڕەیەکی نوێ دوو ستوون بکێشە، لە ستونێکیاندا ناوی ئەو کاروپیشانە بنووسە کە ئارەزووی دەکەیتو چێژ لە راپەڕاندنی دەبینیت، کارێك کە دەگونجێت تا کۆتایی ژیانت ئاسوودەت بکات. گریمان تۆ ئارەزووی وانەوتنەوە یان گەڕانو شوێنەوارناسی دەکەیت، هەموو ئەمانە بنووسە.

لە ستوونی دووەمدا ناوی ئەو کارو پیشانە بنووسە کە هەست دەکەیت لەگەڵ تۆدا دەگونجێت، بە گەڕانەوە بۆ ئەو لیستەی کە یەکەمجار بە تەرکیزەوە نووسیت، گریمان لە لیستەکەتدا ئەمانە بەدی دەکران:

گرنگەکان: کتێبو گۆڤار.

بەهرەکان: نووسینو لێکۆڵینەوە.

ئایدۆلۆژیا: رێزگرتن لە فێرکارو فێرکردن.

کەسایەتی: هەست بە بەزەییەکی تایبەت دەکەیت بەرامبەر منداڵە ناکامەکانو زاناو فێرکارانت خۆش دەوێت.

ئەگەر ئەم خاڵانە بە دی دەکران دەتوانیت لە ستوونی دووەمدا بنووسیت: مامۆستای خاوەن پێداویستییە تایبەتییەکان یان مامۆستای سەرەتایی، بەڕێوەبەری کتێبخانە. بێگومان تووشی سەرسوڕمان دەبیت کاتێك دەبینیت ئەو کارانەی لە هەردوو ستوونەکەدا نووسیوتە تارادەیەکی زۆر لەیەك نزیکن. بێگومان ئەمە یارمەتیدەرت دەبێت بۆ دەستنیشانکردنی کۆلێژێك پاشان پسپۆڕییەك سەرئەنجام پیشەیەك لەگەڵ تواناو ئارەزووتدا بگونجێت.

دەتوانیت داوا لە دایكو باوكو کەسە نزیکەکانت بکەیت تا هەڵسەنگاندنت بۆ بکەنو پێشنیاری ئەو کۆلێژو بەشەت بۆ بکەن کەوا هەست دەکەن زیاتر لەگەڵ تۆدا دەگونجێت.

گەڕان بە دوای پیشەیەکدا:

هەنگاوی سێیەم: هەوڵ بدە زۆرترین زانیاری دەربارەی ئەو کارو پیشەیە کۆبکەیتەوە کە ئارەزووی دەکەیت.

دوای ئەوەی لیستەکەت ئامادەبوو، سەردانی ئەو هاوڕێ، دراوسێ، هاوڕێیانی دایكو باوکت یان هەرکەسێکی تر بکە، کە لەو بوارەدا کار دەکەنو رۆژێکی کاریان لەگەڵدا بەسەر بەرە. تا ئاشنا بیتو بزانیت ئەو پیشانە لە مەیدانەکانی ژیاندا چۆن پیادە دەکرێن.

پرسیارییان لێ بکە دەربارەی خوێندنەکەیان، دەربارەی ئەو کارانەی کردوویانە تاوەکو بتوانن شایستەی راپەڕاندنی ئەو پیشەیە بن.

پرسیاریان لێ بکە دەربارەی گرانترین ئەرك کە لەو پیشەیەدا تووشیان دەبێت، یان چێژ بەخشترین بواری پیشەکەیان، هەوڵبدە زۆرترین زانیاریو وردەکاری دەربارەی ئەو پیشەیە کۆبکەرەوە.

هاوڕێکەم، بزانە پەیڕەوکردنو جێبەجێکردنی ئەم هەنگاوە سادەو ساکارانە یارمەتیدەرت دەبێت تابتوانیت بەشێوەیەکی بەرچاوڕوونو زۆر زانستییانەو تەندروست ئەو بەشە هەڵبژێریت کە دەتەوێت لە زانکۆدا پسپۆڕی تیاوەربگریتو پاشانیش لە مەیدانەکانی ژینتدا خزمەتی خۆتو دەورووبەرەکەتی پێ بکەیت.

سەرچاوە: www.sanabes.com

## وانەیەك بۆ ژیان

**ئەگەر خەڵکی واز لە بەخۆداهەڵدان و زەمکردنی یەکتر بهێنن، زۆرینەی زۆری خەڵك تووشی بێ زمانی دەبن.**

# چۆن بیردەکەینەوە؟

چۆنییەتی بیرکردنەوە پەیوەندی بە دیاریکردنی ئاراستەی ژیانمانەوە هەیە، ئاراستەی ژیانیش ئامانجی بەرهەممان بۆدیاری دەکات.

فەیلەسوفێکی یۆنانی دەڵێت: (پێم بڵێ چۆن بیردەکەیتەوە، هەتا پێت بڵێم دووچاری چ نەخۆشییەك بوویت)، هێزی شاراوەی ناخ توانای دیاریکردنی چاکەو خراپەو جیاکردنەوەی لە یەکتر نییەو نازانێت کە چی بە سودی مرۆڤەو چ زیانو زەرەر لە مرۆڤ دەدات، بەڵکو ئەم زانینو جیاکردنەوەیە کاری هێزی ئاشکراو بە ئاگای مرۆڤە. هێزی شاراوە ئەو بڕیارو ئاگادارییانەی کە لە لایەن هێزی بە ئاگاو خۆویستەوە پێدەدرێت چاو لە ئاستیان دادەخاتو بە هەموو تواناياوە دەست بە ئەنجام دانیان دەکات.

ئەدمۆندئیسپێنەر دەڵێت: ئەوە مێشکی ئێمەیە کە دەوڵەمەندمان دەکات یان هەژارمان دەکات، دڵخۆش یان دڵتەنگمان دەکاتو بەدبەختمان دەکات.

هەموو ئەو شتانەی لە دەوروبەری خۆتدا دەیان بینیت واگومان مەبە کە خۆبەخۆ لە خۆڕادرووست بوون، هەموویان لە ئەنجامی رامانو بیرکردنەوەی خۆتن، پێشەوا عەلی خوا لێی رازی بێت دەفەرموێت: (جیهانی هەر کەسێك بە ئەندازەی بیرکردنەوەو رامانییەتی).

بیرورامانەکانت ئەرکی قورسو گران نین بەسەرتەوە، بەڵکو خۆتی کە بڕیارو بارودۆخەکانی دەوروبەری خۆت ئاکامو ئەنجامی هەمان بڕیارو پلاندانانی بە ئاگایانەی خۆتە کە هەڵتبژاردوون. ژیان وەکو ئاوێنەیەکە، بیرورامانەکانت بۆ لای خۆت دەگەڕێنێتەوە، بە وتەی مەولەوی ئێرانی:

جیهان شاخەو کاری ئێمە هاتو هاوارە.

بەرەو ئێمە دێتەوە دەنگوهەرا هەر بەو هاوارە.

زۆربەی خەڵکی ئارەزوومەندی خۆشگوزەرانیو کەیفو پشوو درێژین، بەڵام لایەك بە لای باشکردنی بیروبۆچوونو رامانەکانیان ناکەنەوە، دکتور ئیبراهیم فەقێ دەڵێت: تۆ ئەمڕۆ لێرەدایت بە هۆی بیرکردنەوەکانی دوێنێتەوە، بەهۆی بڕیارەکانی ئەمڕۆشەوە سبەینێ دەخوڵقێنی.

جاکەوایە باخۆمان بە دوور بگرین لە بیرکردنەوەی سلبی، چونکە وەك دەبینین ئەو کەسەی بە هزر گەلی سلبی بیردەکاتەوە کەسێك دەبینێتو پاڵپشتی لە راکەی دەکات لە هزرەکانیدا پەیوەندی هاوڕێیەتی لە نێوانیاندا دروست دەبێتو لەگەڵ ئەو کەسانەی بیرکردنەوەی سلبیان هەیەو پاڵپشتی لە یەکتر دەکەن. پەندێك هەیە دەڵێت: بەدبەختی بەدبەختی رادەکێشێتو بەدبەختەکانیش بەدبەختەکان رادەکێشن، بە پێچەوانەش راستە.

ئەگەر بیرکردنەوەو رامانی باشو بە کەڵك لە جیاتی خراپو بێ سوودو قەڵب دابنێین ئەوا لە هەموو قۆناغەکانی ژیاندا سەرکەوتودەبین، ئەگەر لە رۆخی دەریایەکدا بینو تەنیا پەرداخێکت پێبێت چەندە دەتوانیت ئاو لەو دەریایە دەربهێنیت؟ ئایا دەریا دەبێتە کۆسپ لە بەردەم هەڵگۆزینی ئاوەکە؟ تەنها کۆسپێك کە دێتە رێگەتو دەبێتە لەمپەر لە هەڵگۆزینی ئاوی زیاتر بچووکیو سنووری کەمی پەرداخەکەیە.

مارکۆس ئەدریلیوس دەڵێت: ژیانمان زادەی بیرکردنەوەکانمانە ئێمە ئەگەر بەشێوەیەك بیربکەینەوەو ئەم پرسیارانە لە خۆمان بکەین دەبینین بیرکردنەوەیەکی ئیجابیمان دەبێت، وەکو ریدپرکلینج دەڵێت: شەش خزمەتکاری دڵسۆزم هەیە کە هەموو زانستەکانم لەوانەوە وەرگرتووە، ئەمیش ئەمانەن: چیم دەوێت؟ بۆچی دەمەوێت؟ کەی بە دەست دێت؟ چۆن بەدەست دێت؟ لە کوێ بەدەستی بهێنم؟ کێ هاوکاریم بکات لە بەدەست هێنانی ئەمە؟

لە ئەمڕۆوە سەرنجی هزرەکانت بدە بەرلەوەی بگۆڕێن بۆ تەرکیز.

سەرنجی تەرکیزەکانت بدە بەرلەوەی بگۆڕێن بۆ هەستکردن.

سەرنجی هەستکردنەکانت بدە بەرلەوەی بگۆڕێن بۆ رەفتار.

سەرنجی رە فتارت بدە بەرلەوەی بگۆڕێ بۆ ئاکام.

سەرنجی ئاکامەکانت بدە بەرلەوەی سەرەنجامت دیاری بکەن.

تۆ ئەو ناونیشانە نیت کە بەخۆتت داوە، یاخود ئەوانی دی بە تۆیان داوە.

یابێ ئومێدی یاراری یاخود شکست نیت.

تۆ تەمەنت یا کێشت یا رواڵەت یا قەبارە یا رەنگت نیت.

تۆ رابردوو نیت، ئێستا نیت، داهاتووش نیت.

تۆ باشترین بە دیهێنراوی کە خوای گەورە بە دیهێناوە.

سەرچاوە: موعجیزەی مێشك/ بیرکردنەوەی سلبیو ئیجابی

**هەڵبژاردنی: کارزان سەلیم**

# لە ڕۆژی جیهانی هاوڕێدا چ هاوڕێیەك هەڵبژێرین؟

ئا: گوڵان حەمە ئەمین

مرۆڤ وەکو بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی هەمیشە حەز بە پەیوەندیو مامەڵەی هاو ڕەگەزەکانی دەکات، بەشێکی زۆری کاتی هەر یەکێ لە تاکەکان لەگەڵ کەسانێکی دەرەوەی خێزانەکاندا بەسەر دەبرێت، تا ئەو ڕادەیەی گەر بێتو مرۆڤێك گۆشەگیر بێتو پەیوەندی کۆمەڵایەتی نەبێت، بە کەسێکی ناتەندروست دادەنرێت لە رووی دەرونییەوە، پەیوەندی هاوڕێیەتیش یەکێکە لەو پەیوەندییە گرنگانەی کە زۆرترین کاردانەوەی هەیە لەسەر ئاکارو ڕەوشتی بەرامبەر، وەك ڕۆژەکانی (ڕۆژی جیهانی منداڵان، ژنان، پیران،...) کە لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بە ڕۆژی جیهانی چینە تایبەتەکانەوە ناسێنراوە، ڕۆژی (٥/٢٥) بە ڕۆژی جیهانی هاوڕێ دیاریکراوە، جێی خۆیەتی ئەم ڕۆژە دیاریکراوانە کە تایبەتن بە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانەوە هەڵوێستەیەك بکەین، ڕەنگە بە هۆی زۆرێك لەسەر قاڵبیەکانی ژیانەوە لە بیرمان کردبێت کە هاوڕێیەتیش بەرپرسیارییەو ئەرکو مافی خۆی هەیە، هەروەك چۆن مەرجی تایبەتیشی هەیە، وەك ئاشکرایە زۆرجار بە ویستی خۆمان بێت یاخود نا زۆرێك لە کاتەکانمان لەگەڵ کەسانێکی دەرەوەی خێزانەکاندا بەسەر دەبەین، یەکێ لە سیفەتەکانی مرۆڤیش بریتییە لە خوگرتن بە ئاکاری دەوروبەرییەوە، کەواتە گرنگە هاوڕێکانمان بناسینو بیان پاڵێوینو هاوڕێیەتی کەسانی نایاب هەڵبژێرین، پەیوەندی هاوڕێییەتیش وەك زۆرێك لە پەیوەندییەکانی تر دوولایەنی هەیە: باش، خراپ، دەربارەی هاوڕێ وتراوە: هاوڕێیەتی هاوڕێی باش وەك ئەو کەسەیە کە بۆنفرۆشە هەر بە چون بۆ لای بۆنخۆش دەبیت، هاوڕێیەتی هاوڕێی خراپیش وەك دوکانی ئاسنگەر وایە هەر بە چون بۆ لای پرزی ئاگرو بۆنی دووکەڵ دەگریت، تۆی خوێنەریش چەندین نموونەت لە لایە لە هەردوو لایەنی پۆزەتیفو نێگەتیف، بۆ زیاتر سوود وەرگرتن لە هاوڕێو هەڵبژاردنی هاوڕێی باشو دوورکەوتنەوە لە هاوڕێی خراپ باشتر وایە بزانین لای زانایانی بواری دەروونناسی کۆمەڵایەتی (علم النفس الإجتماعي) چ پێوەرێك هەیە: پسپۆڕانی ئەم بوارە هاوڕێییەتیان بۆ پێنج جۆر دابەش کردووە: (هەوا، ژەهر، ئاو، سێبەر، دەرمان)...

**١- هەوا:** ئەو هاوڕێیەی کە بەردەوام لەگەڵ یەکتردان بۆ هەموو شوێنێك لە هەموو کاتێکدا تەنانەت لە کاتی گەڕانەوەش بۆ ماڵەوەدا بەبێ یەکتر هەڵناکەن، بە پەیوەندی تەلەفۆنی بەردەوام لەگەڵ یەکدان ئەم جۆرە هاوڕێیە بە (هەوا) پێناسە کراوە، لەبەرئەوەی لە هەموو شوێنێکی ژیانی یەکتردا هەن بێئەوەی هەستی پێبکەن، ئەم جۆرە هاوڕێیە لە جۆرە نێگەتیفەکانە، چونکە تەنها هۆگری یەکتربوونو هیچ سوودێك بە یەکتر ناگەیەنن، بەڵکو کاتێکی زۆری یەکتر بە هەدەر دەبەن.

**٢- ژەهر:** ئەو جۆرە هاوڕێیەیە کە لە کێشەکانی خۆیدا دەتسورێنێتەوە، بەردەوام کێشەی هەیە بۆت، کەسێکی ڕوخێنەرو لاوازەو تۆش بەرەو لاوازی دەبات، تەنها بۆ کارەکانی خۆی بە کارت دەهێنێت، ئەم جۆرە هاوڕێیە بە (ژەهر) پێناسەکراوە لە جۆری هاوڕێ نێگەتیفەکانەو تالێی دوورکەویتەوە باشە.

**٣- ئاو:** جۆرێکی تر لە هاوڕێ بە (ئاو) پێناسەکراوە، ئەویش ئەو جۆرە هاوڕێیەیە کە لەگەڵتا دەگونجێت چۆن ئاو لە هەرجۆرە دەفرێکدا بێت بە وێنەی ئەو دەوەستێت، ئەم جۆرە هاوڕێیەش لەگەڵ هەموو ڕووداوە خۆشو ناخۆشو کێشەو... بەو جۆرە مامەڵەت لەگەڵ دەکاتو هاوکاریت دەکات، بە بێئەوەی مامەڵەی بگۆڕێت لەگەڵتدا، ئەم جۆرە هاوڕێیە لە جۆری هاوڕێ پۆزەتیفەکانە، ئەگەر لەم جۆرە هاوڕێیەت نییە، پێویستە هەرچی زووە بە دوایدا بگەڕێیتو دەستی بخەیت، ئەگەریش خاوەنی ئەم جۆرە هاوڕێیەیت گرنگی پێ بدەو لە دەستی مەدە.

**٤- سێبەر:** ئەم جۆرە هاوڕێیەش لە جۆری پۆزەتیفەو بە سێبەر پێناسەکراوە، کەسێکی ناوازەو ڕەوشت بەرزەو بە هۆی هاوڕێیەتی کردنییەوە تۆش گەورە دەبیت، تۆ لە سێبەریایت بە هۆیەوە ڕێزت لێ دەگیرێت، لە خراپە دەپارێزرێیت، فێری کردەوەی جوان دەبیت... پێویستە لەم جۆرە هاوڕێیەت زۆر بێت.

**٥- دەرمان:** ئەمەش جۆرێکی ترە لە هاوڕێ پۆزەتیفەکان، بە دەرمان پێناسەکراوە، چونکە هەمیشە چارەسەری کێشەو هەڵەکانت دەکات، وەك دەرمان وایە بۆ گرفتەکانت. پێویستە هەر یەکێك لە ئێمە هەوڵ بدات لە سێ جۆرە پۆزەتیفەکە لە پێنج هاوڕێ کەمتری نەبێ، هەر یەکێ لە ئێمەش هەوڵ بدەین لە هاوڕێ پۆزەتیفەکان بین بۆ هاوڕێکانمان، بۆئەوەی چیتر بە هۆی هاوڕێی بێ سودەوە کات بە فیڕۆ نەدەین، نەکەوینە ژێر کاریگەری ڕەوشتی خراپیانەوە، با هەوڵ بدەین هاوڕێکانمان بپاڵێوینو هاوڕێ بە سودەکان هەڵبژێرین بۆ هاوڕێی ژیانمان.

و: عوسمان سەنگاوی

# چیرۆکی ئەو مشکەی بوو بە پڵنگ

وڵاتێك ڕووبەرەكەی هەر هێندەی پارێزگای (الوادی الجدید)ی وڵاتی میسرە، كە دەكاتە (٣٢٠) هەزار كیلۆمەتر چوار گۆشە، ژمارەی دانیشتووانی تەنها (٢٧) ملیۆن هاوڵاتییە، تاوەكو ساڵی ١٩٨١ لە ناو دارستانەكاندا دەژیانو كاریان بریتی بووە لە كشتوكاڵی دارو مۆزو ئەنەناسو ڕاوە ماسی، داهاتی ساڵانەی یەك هاوڵاتییان كەمتر لە هەزار دۆلار بووە، ئەم وڵاتە دووچاری چەندین گرفتی گەورە ببوو، لەوانە ململانێی ئاینی كە هەژدە ئاینی تێدا بووە!

ئەو بارودۆخە بەردەوام بووە تاوەكو خوای گەورە كەسێكیان لە ناودا دەردەخات بە ناوی (mahadir bin mohamat) (مەهاتیر محەمەد)، هەروەك چۆن لە تۆمارگەی وڵاتی مالیزیادا ناوی هاتووە.

(مەهاتیر محەمەد) لە بنەماڵەیەك گەورە بووە كە هەشت برای لە خۆی گەورەتر هەبووەو باوكی مامۆستای سەرەتایی بووە، كە مووچەكەی هێندە كەم بووە نەیتوانیوە خەونی مەهاتیر بهێنێتە دی، كە خەونی بە كڕینی پاسكیلێكەوە دەبینی تا هاتوچۆی قوتابخانەی پێ بكات، هەر بۆیە مەهاتیر ناچار دەبێت دەست بكات بە فرۆشتنی مۆز لەسەر شەقامەكان، تاوەكو خەونەكەی هاتە دیو پاسكیلێكی كڕی، دوای تەواوبوونی قۆناغی ئامادەیی دەچێتە كۆلیژی پزیشكی لە (سەنغافورە)، هەر لەوێ دەبێتە سەرۆكی یەكێتی قوتابیانی موسڵمانان لە هەمان زانكۆدا تا ساڵی ١٩٥٣، پاشان دەبێتە پزیشكی حكومەتی بەریتانی كە ئەو كاتە وڵاتەكەی لە ژێر دەستی ئەواندا بووە، لە ساڵی ١٩٥٧ كاتێك مالیزیا سەربەخۆیی وەردەگرێت، مەهاتیر عیادەیەكی تایبەتی دەكاتەوە بۆ نەشتەرگەری، نیوەی كاتەكەی لە عیادەكەیدا تەرخان دەكات بە بینینی نەخۆشە هەژارەكان بەبێ بەرامبەر، ساڵی ١٩٦٤ هەڵدەبژێردرێت بە ئەندامی ئەنجومەنی نیشتمانی، بەڵام دوای پێنج ساڵ ئەو پۆستە لە دەست دەدات، ئیتر دەست دەكات بە دانانی كتێبە بە ناوبانگەكەی بەناوی (ئایندەی ئابوری مالیزیا)و لەساڵی ١٩٧٠ تەواو دەبێت.

ساڵی ١٩٧٤ دەبێتە (سیناتۆر)ی وڵاتەكەی، لە ساڵی ١٩٧٥ دەكرێتە وەزیری فێركردن، دواتر بە جێگری سەرۆك وەزیران لە ساڵی ١٩٧٨، ساڵی ١٩٨١ دەبێتە سەرۆك وەزیرانو هەر لەو كاتەوە هەنگاوە گەورەكانی بۆ بەرەوپێشبردنی مالیزیا نا.

## ئەم پزیشكە مالیزییە چی كرد؟

یەكەم: نەخشەی وڵاتی مالیزیای كێشاو كارە سەرەتاییەكانی دەستنیشان كرد لەگەڵ ئامانجەكانو بەرهەمی كارەكان كە بۆ سێ قۆناغ دەستنیشانی كردبوو، ئەویش دەساڵ، پاشان بیست ساڵ، دواتر تا ساڵی ٢٠٢٠.

دووەم: بڕیاریدا كە بوارەكانی زانستو فێركردنو توێژینەوەی زانستی بكاتە پێشەنگی هەموو بوارەكانی ترو گرنگی زۆر زیاتریان پێ بداتو زۆرترین بودجەی مالیزیای خستە بواری پیشەیی زانستیو نەهێشتنی نەخوێندەواریو پەروەردەو فێربوونی زمانی ئینگلیزی، هەروەها دەیان هەزار كەسی وەكو نێردراوی خوێندن ڕەوانەی زانكۆ هەرە باشو بە ناوبانگەكانی جیهان كرد، ئەمانە پێشەنگی كارەكانی مەهاتیر بوو، ئیتر گرنگی بە سوپا نەدا، چونكە ئەوانە نە لەكاتی شەڕدا بوون، نە هەڕەشەی دەرەكیشیان لەسەر بوو، بە جیا لەوەی لەو كاتەدا سەرۆكو پادشاو كاربەدەستانی زۆرێك لە وڵاتان سەرقاڵی بە فیڕۆدانی سەروەتو سامانی وڵاتەكەیان بوون، لە دروستكردنی كۆشكی تایبەت بە خۆیان، سازدانی ئاهەنگی تایبەتو ئیسراف كردنێكی زۆر لە هەموو بوارەكاندا كە هیچ سودێكی بۆ پێشكەوتنی وڵات نەبوو.

سێیەم: سەرجەم بڕیارو ستراتیژو هەنگاوەكانی زۆر شەفافانە خستە بەردەم گەلو ئەوانی لێ ئاگادار كردەوە،

سستەمی پاداشتو سزای لەسەرجەم داموو دەزگاکاندا دانا بۆ گەیشتن بە ڕابوونێکی گەورە، ئەوەش بوو بە هۆی ڕازی بوونی هاوڵاتیانو پاڵپشتی زۆری خۆیان بۆ ئەم جۆرە بڕیارانە دەربڕی.

سەرەتای کار لە کەرتی کشتوکاڵییەوە دەستی پێ کرد، لە دوو ساڵدا ئەویش بە ناشتنی یەك ملیۆن داری خورمای تایبەت بە دروستکردنی ڕۆنی خورما، بۆئەوەی مالیزیا ببێتە یەکەمین وڵات لەسەر ئاستی جیهان بۆ بەرهەمهێنانو هەناردەکردنی ڕۆنی خورما!

کەرتی گەشت و گوزار: بڕیاردرا لە دەساڵدا داهاتی کەرتی گەشتوگوزار لە نۆسەد ملیۆن دۆلارەوە بەرز بکرێتەوە بۆ بیست ملیار دۆلار! ئەم کارەش سەرکەوتنی خێرای بە دەستهێنا کە ئێستا مالیزیا بۆ تەنها ساڵێك بڕی (٣٣٠٠٠٠٠٠٠٠) سیو سێ ملیار دۆلاری دەست دەکەوێت!! ئەوەش بە کردنی ئەو سەربازگانەی سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانی کە یابان لەو وڵاتەدا دروستی کردبوو بە شوێنی گەشتوگوزار، کە سەرجەم هۆکارەکانی خۆشگوزەرانی تێدایە، هاوکات لەگەڵ بوونی مەڵبەندی وەرزشیو ڕۆشنبیریو هونەری، ئەوەش وایکرد کە مالیزیا ببێتە سەنتەرێکی جیهانی بۆ ئەنجامدانی پێشبڕکێ نێو دەوڵەتییەکانی ئەسپ سواریو پێشبڕکێی ئۆتۆمبیلو یارییە ئاوییەکانو چارەسەری سروشتیو زۆر بواری دیکە.

کەرتی پیشەسازی: لەم بوارەشدا مالیزیا هەنگاوی گەورەی نا کە تەنها لەساڵی ١٩٩٦دا ڕێژەی زیادکردنی پیشەسازی گەیشتە لە ٤٦٪ کە ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بەرەو پێشچوونە خێراییە گشتگیرییەی کە لە بوارەکانی ئامێرە کارەباییەکانو ئەلیکترۆنییەکاندا بەخۆوە دەیبینی.

لە بواری چالاکی داراییدا: ئەوەش بەکردنەوەی دەرگا لەسەر کۆمپانیا وەبەرهەمهێنەکانی ناوخۆییو دەرەکیدا بە شەفافانە کاربکەن بۆ دروستکردنی بەرزترین دوو تاوەر لە جیهاندا بەناوی (پترۆناس) لە (کوالالامپور)ی پایتەختی ئەو وڵاتە کە (٦٥) مەڵبەندی بازرگانی لە خۆ دەگرێت، دامەزراندنی بۆرسەی دارایی کە ڕێژەی مامەڵەی تەنها ڕۆژێکی دەگاتە دوو هەزار ملیۆن دۆلار!!

دامەزراندنی گەورەترین زانکۆی ئیسلامی لە ئاستی جیهاندا یەکێکی تر بوو لە پرۆژەکانی (مەهاتیر محەمەد)، ئەم زانکۆیە گەنجانی کەنداویش بە لێشاو ڕوویان تێکرد بۆ فێر بوونی زانستەکان، هەروەك شاری (پوتراجایا)ی کردە پایتەختی ئیداریو شاری (کوالالامپور)ی کردە پایتەختی ئابووری کە لە ئێستادا ئەو شارە دوو ملیۆن کەسی تێدا دەژی، بەڵام ئامادەباشییان کردووە بۆئەوەی حەوت ملیۆن کەسی تێدا نیشتەجێ ببێت، کە دەگونجێت بۆ ساڵی ٢٠٢٠ بگاتە ئەو ڕێژەیە.

ئەوشارە دوو فرۆکەخانەی گەورەو دەیان ڕێگاو شەقامی گەورەی تێدا کراوە بۆ کار ئاسانی گواستنەوەی دانیشتوانو ئەو گەشتیارو وەربەرهەمهێنەرانەی کە لە وڵاتانی چینو هیندو جیهانەوە ڕوو لە مالیزیا دەکەن.

بەکورتی:

(حاجی محەمەد مەهاتیر) توانی لە نێوان ساڵەکانی ١٩٨١ بۆ ٢٠٠٣ وڵاتەکەی لە ئاستێکی زۆر نزمو دواکەوتوییەوە بگەیەنێتە ئاستێکی زۆر بەرزوکەم وێنە لە جیهاندا، کە داهاتی تاکە کەسێك لە مالیزیادا لە (١٠٠٠) دۆلارەوە بگەیەنێتە (١٦٠٠٠)هەزار دۆلار بۆ ساڵێك!! یەدەکی نەختی دراو لە (٣٠٠٠٠٠٠٠٠) سێ ملیار دۆلارەوە بگەینێتە (٩٨٠٠٠٠٠٠٠٠) نەوەدو هەشت ملیار دۆلار، کار بۆ ئەوەش دەکرێت ئەو ڕێژەیە بگاتە (٢٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) دوو سەد ملیار دۆلار!!!!!

لە کاتێکدا ژمارەی دانیشتوانیش لە زیادبووندایەو لە چواردە ملیۆنەوە گەشتونەتە بیستو هەشت ملیۆنو هەژدە ئاینی تێدایە.

لە هەمووی گرنگتریش ئەوە بووە کە وەکو هەندێك لە سەرۆكو پادشاکانو کاربەدەستانی وڵاتان دەستبەسەر کورسی دەسەڵاتدا بگرێتو بۆ نەوەکانی خۆی بەجێ بهێڵێت، بەڵکو لە ساڵی ٢٠٠٣ بە ویستی خۆی ئەرکی سەرۆکایەتی لە ئەستۆی خۆی داماڵیو پێشکەشی نەوەکانی دیکەی کردەوە، هەرچەندە ناڕەزایی زۆر دروستبوو لەسەر ئەوەی (حاجی محەمەد مەهاتیر) دەستبەرداری پۆستەکەی نەبێت، بەڵام ئەو نەخشەی ئایندەی مالیزیای ئامادەکرد کە ساڵی ٢٠٢٠ دەبێتە چوارەم هێزی ئابووری لەسەر ئاستی کیشوەری ئاسیا لە دوای چینو یابانو هیند.

ئەمە ئەو پزیشکەیە کە وڵاتی مالیزیای لە مشکێکەوە کردە پڵنگێگ لە جیهاندا کە هەزاران ئاماژەو خوێندنەوەی بۆ دەکرێت...

ئەی کەسانی لە مەڕ خۆمان چییان کرد؟
ئەی سەرکردەکانو کاربەدەستان؟
ئەی پزیشكو مامۆستاو ڕۆشنبیرانو؟

پێشکەشە بە گۆڤاری بڕیار

# سەربازی ون

فریشتە مەرەج فەتحوڵا

ڕێگام سەختە
هەر لادانێك لەم ڕێگایە
بەڵایەکە... بۆ گیانی من
هەوڵ ئەدەم...بڕیار ئەدەم
بەردەوام بم لەم ڕۆیشتنەم
تا ئەگەم بە
مەنزلگە ڕاستەقینەکەم
چوون ئەزانم
ڕێگەم ڕاستە
ئیتر بۆ شەرمەزار ببم؟
ئەشزانم دوژمنم زۆرە
هەر خەریك تانەو تەشەرن
بەڵام من خوام لێ ڕازی بێت
گوێ نادەمێ...
هەزار ئەوەندە تەشەر بێت
وەك سەربازێکی ون...
خۆم ئەبینم
لە سەنگەرام
حەز ناکەم هەموو کاتێکم
هەر نەفرەت بێت لە تاریکی
هەوڵ ئەدەم بۆ پاش مەرگم
هێندەی ڕووناکی مۆمێکیش بێت
دیاری دەستی نەوەکەم بێت
نەخشەم دەمێکە داناوە
دوژمنان خەیاڵیان خاوە
هەرگیز ناگەڕێمە دواوە
ئەگەر ڕۆحیشم داناوە

# سۆزێك بۆ 2 ساڵ تەمەنی بڕیار

شاگوڵ عوسمان حسەین

خودایە ‥ بۆ ئەم شاکارە جوانە‥
بۆ ئەم سمبولە پڕ لە ئومێدە زیاترو زیاتر سەرکەوێت‥ چونکە بە تەنها نین‥ خەمی ئێمەشیان پێیە.
ئەی بڕیارەکەم ئەی خاوەنی هەموو هەست و سۆزم… تاقانەی نێو نوسراوەکان‥ماڵە پڕ لە ڕەنگە جوانەکان‥
ئەی باخچە پڕ لە گوڵو پەپوولەی نێو خەونەکان‥ بۆنت وەك سنەوبەری تەڕی هەمیشە سەوزە‥
سروودی نێو هەموو کۆڵانەکان‥ پەلکە زێڕینەی خەونەکان… پڕ لە مانای بەرزی ژیان.

**سڵاوت لێبێ بڕیار** ‥ ئەی تاکە پەڕاوی خەمی من‥ ئەی تاکە نوسراوی نێو زمانی من‥ ئەی تاکە مژدە بەخشی لاوی من‥ ئەی جوانتر لەوەی دەتبینم، چێژی عەقڵ و سەوزایی دڵ و خەندەی سەرلێوو ژەم ژەمی پڕ لە خوانی مەعریفەی من… ئەی کەتەلۆکی سەرکەوتنەکانی من!!

**سڵاوت لێبێ بڕیار**‥ زۆر لە مێژە دەگەڕامو سۆراغم دەکرد لە نێو ئەم پەڕە زەردو لاوازانەی گۆڕەپانی شارەکەم‥ نەپەڕەیەك خەمی ڕاستەقینەی منی پێبوو‥ نە پێنوسێك دەستی دەگرتمو فێری وشە بە وشەی ژیانی دەکردم‥ نە شەقامەکان هێندە پڕ لە زانیاری بوو هەرکەس هەنگاوی ماڵی خۆی بزانێ.

**سڵاوت لێبێ بڕیار**‥
تۆ دەستت گرتین وەك منداڵێك لە یەکەم هەنگاوەوە فێرت کردین‥ وەك زمانێك لە نامۆیی نێو ڕێبواری کوردی ئاشنات کردین‥

**سڵاوت لێبێ بڕیار**‥ زۆرم خۆش دەوێیت‥ تەنها ڕێگا نیشاندەرم نیت، بەڵکو پەیتا پەیتا‥ پیت بە پیت‥ وشە بە وشە‥ ڕستە بە ڕستە‥ پەڕە بە پەڕە هاوڕێی منیت‥ تۆ لە نێو نوسراوەکانی ئەمڕۆی نیشتمانمدا هاوشێوەی مانگیت‥ ئەی چراخانی شەوانی زەنگم‥ ئەی پاڵەوانی ڕێگای ڕاستم‥

**سڵاوت لێبێ بڕیار**‥ هەر لە یەکەم بەرگی نوسراوەکاندا‥ هەر لە ڕەنگی پڕ لە جوانی پەڕەکاندا‥ هەر لە یەکەم پەڕەی نێو خواستەکاندا‥ هێور هێور لە گەڵم دێیت‥ چەند ئارامیت لەگەڵم‥ هەموو ئەو ڕەوشتە جوانەت بۆ هێناوم‥ هەموو ئەو پەیکەرانەت بۆ دروست کردووم‥ هەموو ئەو چیرۆکانەت بۆ خوێندومەتەوە‥ هەموو ئەو سروودانەت بۆ چڕیوم‥ هەموو ئەو ئاوازانەت بۆ داناوم‥ هەموو ئەو وێنانەت بۆکێشاوم‥ هەموو ئەو سێبەرانەت بۆ کردوومەتە شانۆ‥

**سڵاوت لێبێ بڕیار**‥ لە لایەك دەم دوێنیت بە زمان‥ لە لایەك دەم هەژێنی بە ویژدان‥ لە لایەك ڕاماوم دەکەیت لە فکر‥ لە لایەك خەمم دەخۆیت‥ کە بچکۆلانە بووم‥ لە لایەك خەمم دەخۆیت لە نێو ئازارەکانی منی گەنج (کوڕانو کچان) دەم کەیتە هیوایەك لە نێو سەمای پڕ لە خزمەتی نیشتمان‥ لە لایەك گەورەم دەکەیت‥ بە کۆمەڵێ ئادابو ڕەوشتی بێ وێنەوە دەم خەیتە بازاڕو هێور هێور نرخی شتەکانم پێ دەڵێیت‥ هەموو جارێکیش خاتری دڵی منیش دەگریت‥ لە لایەك دەمکەیتە فەرمانبەرێك وەکو سەرکردەیەك گەورەم دەکەیتو هەر لەگەڵ زولاڵی دەم بەیانییدا‥ هێور هێور هەر لە بەیانی باشی کارمەنداندا‥ فێرم دەکەیت تا دەگەمە ئەو بڕیارەی ڕێزی کورسی ئێستام هاوتەریبە لەگەڵ کارامەی کاری بەڕێوەبردنم‥ لە لایەك دەروونم بەتاڵ دەکەیتەوە‥ لەگەڵ خۆمدا ئاشنام دەکەیتەوەو ناوم دێنی بە هاوڕێی خۆتو‥ پرسیارەکانی… چۆن بڕیار بدەم؟

کەی بڕیار بدەم؟ بۆچی بڕیار بدەمم؟ لەلا دروست دەکەیتەوە.. لە لایەك لە یادت ناچێت لەگەڵ بوونی سەلیمی من.. بە هەنگاوەکانم بۆ لای خێزان.. بۆ خۆشەویستی نێو ئامێزی دایکانو باوکان.. خەندەی ڕۆژی دوای نێو شەقەمەکانی باخچەی ژیان.. لە لایەك لەگەڵ هەموو پرسیارێك لە لای من.. تۆ وەڵامی وەڵامەکان دەدەیتەوە تۆ چالاکتر ناوم دەدۆزیتەوە.. تۆ لە نێو ئاسۆی وێنەی مندا.. لەگەڵ ڕاهێنانی مێشکی مندا.. دەگەڕێیت بۆ باشترین بڕیار لای من..

سڵاوت لێبێ بڕیار.. پێم دەڵێیت گەر هەژاری مەترسە.. گەر دەوڵەمەندی لە بەخشین مەترسە.. گەر بە توانایت زیاتر کارابە.. گەر بە ئومێدیت هەوڵ بدە.. گەربێ ئەرکیت.. خۆت چالاك بکە.. گەر نەزانیت خۆت فێربکە.. سڵاوت لێبێ بڕیار.. خۆشەویستیت بێ وێنەیە.. بڕیار تۆ گەورەیت.. بڕیار تۆ بەخشندەیت.. تۆ بە ویژدانیت.. سنوور بە سنوور.. هەنگاو بە هەنگاو دەستمان دەگریت لە چاو تروکاندنێکدا دەمانخەیتە سەر کەشتییەك.. وەکو میوانێك.. وەکو حەکیمێك فێری ڕێگاکانی داناییمان دەکەیت.. وەکو بەهارێك.. هەمیشە سەوزمان دەکەیت.. وەکو باران تینوێتیمان دەشکێنیت.. ئێمەی ڕێبوارو غەریبی دنیا.. ئاشنامان دەکەیت بە ماناکانی ژیانو وانەکانی وەفا..

سڵاوت لێبێ بڕیار.. لە چیرۆکێکی کورتدا.. لە وتەیەکی پڕ مانای سەفەردا.. چەند جوانی.. کۆمان دەکەیتەوە لە نێو هەموو ڕەنگەکانداو.. لە نێو هەموو شەپۆلەکانی ژیاندا بێ جیاوازی.. لە لایەك هێزی عەقڵو ژیریو خۆشەویستی.. لە لایەك وەفاو ڕێزو دڵنەوایی.. لە لایەك لێبوردەییو ئاشنایی.. لە لایەك دڵی پڕ لە حەسرەتی نێو تەنیایی.. لە لایەك دیکۆری جوانی دڵڕفێن.. هەر بە شەپۆلی پەڕەکان.. هەر بە بۆنی ڕەنگەکان.. هەر بە مانای وێنەکان.. هەر بە پێنووسی نوسراوەکان.. لەسەر تەختەی شانۆی ژیان ناومان دەهێنێت بە ئێمان.. سەبوری دێت بە دڵەکان.. لە نێو بەرزی باڵەخانەکان.. لە ترۆپکی سرودی خەونەکان.. چەند بە ئاگای لێمان.. لە نێو عەقڵو ژیرییەکی بێ وێنەدا.. جارجارە سیماو ڕەوشتی پۆشاکەکان.. بە هەموو دڵفراوانییەکیش لە تازە بوونەوەی زمانەکان..

سڵاوت لێبێ بڕیار.. چەندم خۆش دەوێییت.. ئەو زمانەی کە لێمان تێدەگات.. خوارییەکانمان وەکو ئاوێنە ڕاست پیشانمان دەدات.. لە نێو هاوپۆلەکانماندا سەرمان دەخات.. چەند بەڕێزە ئەو هاوڕێیەتییە.. لە نێو قوربانییەکاندا خەممان دەخوات..

سڵاوت لێبێ بڕیار.. پێنوسی هەموو نوسراوەکانی ئەمڕۆی بە ناو گۆڤار.. نازانم ناوێکی تر هەبێت لە تۆ.. یان هەموو ئەوانەی تر بچنە دەرەوەی گۆڤاری تۆ.. تۆ گۆڤارێکی گەشەی نوری دڵ و عەقڵ و زمانیت.. تۆ هەمیشە وەکو بووکی نێو خەرمانی.. وانەی نوێمان پێ دەڵێی.. خوێندنەوەیەکی نوێمان پێ دەبەخشیت.. هەموو ژمارەیەك گوڵێکی جوانتر دەدەیت لە یەخەمان.. سەرکەوتنەکانی ئەم ڕۆژانە مێژووی تۆی پێیە بڕیار..

سڵاوت لێبێ بڕیار.. تۆ لە دایکێکی نوسراوی میهرەبان دەچیت.. ئێمەش وەکو منداڵێك لەگەڵ دەستە نەرمەکانی تۆی دایکدا هەنگاو هەنگاو دەڕۆین.. هەندێجار ناتوانین بگەینەوە پێت.. لەبەر تەماشاکردنی ئەملاو ئەولای خۆمان.. دەزانم تۆ لە نێو خەونی تاك بە تاکی خوێنەرەکانی خۆت لە وەزیاتریت... ئێمە قوتابیو تۆش مامۆستای وانەکانی بڕیاری ژینیت.. پلانی سەرکەوتنیت.. ئێوە بەهێزن هەروەکو چیاکان.. ئێوە گەورەن وەکو باڵای چنارەکان، (چونکە تەنها ئێوەن بێ هەست کردن بە ماندویەتی بێ دریغی.. بەڵکو کردووتانە بە ئەرکی سەرشانی خۆتان خەمی هاونیشتیمانەکانتان)،

سڵاوت لێبێ بڕیار.. خەم لە پێنوسم دەخۆیت.. لە یەکەم وانەی ژیانم.. تۆ لەو مامۆستایە دەچیت.. کە ڕێنووسی وانەکانی خوێندنی بۆ ڕاست دەکردینەوە، چەند بە بەخشندەوە لێمان دەڕوانیتو ڕێنوسەکانمان لەسەر دەفتەری ئامانجمان لە نێو کاتەکانی وانەی ژیانمان ڕاست دەکەیتەوە..

سڵاوت لێبێ بڕیار.. تۆ ئەو ئەندازیارەی کە بە ئەندازە خەونەکانم بەرزدەکەیتەوە.. تۆ ئەو دکتۆرەی بە چارەسەری داناییت ژیانمان بۆ دەگەڕێنیتەوە.. تۆ لەو وتارانە دەچیت کە هزروبیرمان تێر دەکەیتەوە لە بوونیەتی هیوای ئەمڕۆو سبەی.. تۆ لەو شاعیرە دەچیت.. کە چەند دوور بڕۆیت نزیك دەبینەوە.. وەختێك دەزانم کەوتووینەتە نێو وەڵامی پرسیارەکانی خۆمانەوە.. تۆ لەو مافناسە دەچیت لە نێو ڕێزی یاسادا لە نێو کورسییەکانی دادگادا.. بیرمان دەخەیتەوە کە ماف بدەین بە هەمووان ..

سڵاوت لێبێ بڕیار.. سڵاو لە هەموو پێنووسە بە ئەمەکەکان.. سڵاو لەو تاڵ بە تاڵی ڕووناکیانە پێکەوە ڕۆژێکی پرشنگداریان تۆمارکردووەو بەردەوام لە ڕۆژی تازەدان بۆمان.. سڵاوتان لێبێت..

ئێمە بە بۆنەی ئێوەوە خۆشەویستمان زۆربووەو هەرجارەی چەند هاوڕێ بە دەستو دیارییەکەی بڕیارەوە خۆمان ئاشنا دەکەینەوەو کە دەمان بینن پێش هەواڵی خۆمان بپرسن! هەواڵ لە ژمارەی تازەی بڕیار دەپرسن؟...

بڕیار زۆر لەمە بە تواناترە، ببورن ئێمە لە بچووکی خۆمانەوە ئەوەندە دەتوانین ڕێزو وەفاو خۆشەویستی دەربڕین.. سوپاس بۆ تۆ خودایە کە لە نیشتمانەکەی ئێمەدا ئەم شاکارە پڕ لە پەیمانو پڕ لە نموونە بەرزەی تێدایە.. سوپاس بۆ تۆ خودایە کە ئێمەشی بەسەرکردەوە.. کۆمەڵێ کەسی بەهێزو بە توانا لە نێو ترۆپکی خەونەکانی خۆیاندا جێیان بۆ پێی ئێمەش کردەوە، ئەوان مێژوو.. ئێمەش قوتابی ئەو مێژووە.. زانکۆیەك پڕ لە مەعریفەو بەهاتان پێبەخشین... خودایە ئەم نموونە جوانە زیاتر دامەزراو بکە.. خودایە زیاتر سەرکەوتووو بوێریان بکە، خودایە لەوە زیاتریان پێببەخشە کە هیوا خوازن، چونکە دەزانم ئێمەش بەشێکین لەسەرکەوتنی خەونیان.. خودایە نموونەیان زیاد بکەو ئێمەش بکە بە یەکێك لەم نموونە چاكو پیرۆزانە...

بڕیارەکەم پیرۆزت بێت... بەڵێ بە تواناییت، بەڵێ بەهێزیت.. بەڵێ پڕیت لە جوانییەکانی واقیعی مرۆڤ.. دەست خۆشیتان لێدەکەین... خۆشم بە خۆشحاڵ دەزانم کە لە نێو هەموو قورساییەکانی ئەمڕۆی دنیادا خوێنەرێکی تۆی بەڕێزم... تۆ جیاوازی نێو پەڕەکان بیت بەدڵنیاییەوە.. هەروا دەبێت بەرهەمەکەشت زۆر بە توانا دەبێت... ئێمەش قەرزاری هەموو پیتو وشەو ڕستەو هەنگاو بە هەنگاوی ماندووتانین.. خودایە سوپاس بۆ تۆ... ببورن کە نەمان توانی وەك پێویست یان بە پێوانەی وشەیەك لە ماندوویی ئێوەو سوودمەندی ئێمە لە بڕیار.. ناوتان بێنین ببورن.. زۆر لە مانەش کە نوسراوە بەهێزترن، چونکە دەشێت قوتابی زیرەك بێت بەس هەرگیز نەبووە خاوەنی هەموو ئەو دڵسۆزییەی مامۆستا بێت، بۆیە پیرۆزبایی لە هەمووستافی بڕیار دەکەم، لە هەموو خوێنەرانی، چونکە ئێمە لە بڕیاردا کۆبووینەتەوە بۆ وەرچەرخانێکی هەموو لایەنەکانی ژیانو بەرەو سەرکەوتنێکی زیاتر بە ویستی خودا،

# ئاسۆی وێنەیەك

سەرنجی ئەم وێنەیە بدەو بە دیدو خەیاڵی تیژو
هەستی ناسکت بۆی بنوارەو پاشان خامەکەت
هەڵبگرەو گوزارش لەو هەستە ناسکو خەیاڵە
وردو سۆزە بێ سنوورەت بکە،
تا ببیتە خاوەنی یەکێک لەم دوو خەڵاتەی خوارەوە:

- بەشداری بێ بەرامبەری ساڵێکی گۆڤاری بڕیار.
- بەشداری بێ بەرامبەری شەش مانگی گۆڤاری بڕیار.

**دوا مۆڵەتیش بۆ وەرگرتنی وەڵامەکان
(١٠) ڕۆژ دوای دەرچوونی گۆڤارەکەیە.**

# ڕاهێنانی مێشک

**بە وردی لەم وێنەیە ورد بەرەوەو**

**هێزی مێشکو بیرکردنەوەت بخەرەکار،**

**بزانە چی دەبینیت؟**

**تا چ ڕادەیەک دیدی تێڕوانینت وردە؟**

**خەڵاتی یەکەم**

**بەشدار خەلەکانی**

من دڵنیام بەرەو لوتکە هەنگاو دەنێم
دوودڵیشنیم
باش دەزانم ڕێگای هاتوو نەهاتیمە
هەنگاو دەنێم
چقڵ و چاڵی و چۆڵی دەبڕم
هیچ ناترسم
گەر وەك خاڵی خاڵخاڵۆکە
ڕەشبینم کەن
بۆ ساتێکیش سارد نابمەوە
تیژتر وە تیژی چقڵەکان
ڕێگا دەبڕم
بێ هیوایی لە هەگبەی ڕێگامدا نییە
ئامانجدارم
بۆ تارو تارمایی ڕێچکۆڵان
ناخەڵەتێم
پشتم هەیە
ڕێ ڕۆشنی و کەتەلۆکی ژینم پێیە
توێشوم پێیە
رووناکی ئاسۆ دەبینم
پشت بە یەزدان
هەتا دوا هەناسەی ژینم
بەردەوام دەبم لە ڕۆیشتن
لەسەر ڕاستە ڕێگای ژیان
هەتا گەیشتن
بە لوتکەی بەرزی پێگەیشتن

**سوپاس بۆ ئەو بەڕێزانەی کە لە خوارەوە ناویان هاتووە.**
**بە شیعر یاخود پەخشان بابەتیان ناردووە بۆ ئاسۆی ژمارە (٢٣)**

**١- بەرزان عوسمان کەریم ٢- وەردە حەمە عەزیز**
**٣- هیشام عەبدولعەزیز ٤- رزگار غەریب حەمە لاو**
**٥- ژیـــان عوسمان حسین ٦- ئاسودە نورەدین**
**٧- بەرهەم محەممەد ئەمین**

پەری شێخ کەریم

سەرەتا: پیرۆزبایی خۆم ئاراستەی هەمووبەڕێزانی ستافی گۆڤاری بڕیار دەکەم بەتایبەتی ئەو بەڕێزانەی کە ماندووبونێکی زۆر دەکێشن بۆ زیاتر پەرەپێدانی گۆڤارەکەو ئەو ئازیزانەی کە بەبەرهەمە جوانەکانیان بەردەوام گۆڤارەکەمان دەرازێننەوە زۆر سوپاس بۆ هەموو لایەک داوا کارم خوای گەورە سەربەرزو سەرکەوتووتان بکات.

# تەلەفزیۆن و خێزان!!

تەلەفزیۆن و خێزان!!

تەلەفزیۆن یەکەم هۆکاری ڕاگەیاندنە کە بە دەنگورەنگ بەرهەمەکانی تیادا نمایش دەکرێت، کۆمەڵێ بەرنامەو درامای جۆربەجۆری تێدایە، کە هەندێکیان سوودمەندنو هەندێکیان زیانبەخش!!

هەروەك دەزانن هەموو شتێك سوودو زیانی هەیە، بەڵام جۆری کەسەکانو شێوازی بەکارهێنان ڕۆڵی خۆیان دەبینێت.

بە پێویستم زانی لەم ژمارەیەدا باسی ئامێری تەلەفزیۆن بکەم کە بێگومان ئەمڕۆ لە هەموو ماڵێکدا هەیە، بۆئەوەی بزانین تا چ ڕادەیەك توانیومانە سوود لەم ئامێرە وەربگرینو نەیەڵین کاریگەری خراپی هەبێت لەسەر خۆمانو نەوەکانمان.

هەروەك دەزانین ئامێرەکە بۆ کۆبوونەوەی خێزانو دڵخۆشی و دوورکەوتنەوە لە بێزاریو دڵتەنگی، یا شارەزابوونو کۆکردنەوەی زانیاری بەسوود لە هەموو بوارێکدا کە ویستت لێ بێت، دەتوانی کەڵکی لێ وەربگریت، بەمەرجێك بەپێی بەرنامەیەکی دروست بەکاربهێنرێت، نەك هەموو کاتەکانی ژیان گەڕان بێت بەدوای ئەم کەناڵو ئەو کەناڵدا بە بێ هیچ ئامانجێك، بەتایبەتی تەماشاکردنی ئەو کەناڵانەی جگە لە بەرنامەو درامای بێسوود هیچی تر نییە، بەڵام ئەگەر خۆمان ویستمان لێبێت چەندەها کەناڵی بەسوود هەیە بۆ خۆمانو نەوەکانمان کە بەکاریان بهێنن، هاوکات پێویستە منداڵەکانمان فێربکەین خۆشەویستیان بۆ ئەو کەناڵانە هەبێت کە زانیاری باشی لێوە فێردەبن و سوودبەخشە بۆ ژیانیان، جا لەم ڕێگایەوە دەتوانین خۆمانو خێزانەکەمان لەسەربنەمایەکی ڕاستو خووڕەوشتی جوان پەروەردە بکەین.

ئەو هۆکارانەی دەبێتە مایەی خراپ بەکارهێنانی تەلەفزیۆن زۆرنو لێرەدا چەند خاڵێك باس دەکەین کە دەبێتە مایەی زیان بە تاکەکانی خێزان:

هۆکاری یەکەم: زۆرێك لە هاوسەران بەهۆی بەردەوام تەماشاکردنی دراما بێسوودەکانەوە تووشی چەندەها کێشە بوون، بۆ نموونە: ژیانی هاوسەرێتی خۆی پەیوەست دەکا بە فلانە هونەرمەندەوە! هەمیشە سەرزەنشتی هاوسەرەکەی دەکات بەوەی کە ئەو هونەرمەندە چەندە ڕێزی خێزانەکەی دەگرێت! چەندە بە جوانی قسەو هەڵسوکەوت دەکات لەگەڵ خێزانەکەیدا!

ئەمەش نموونە هێنانەوەیەکی ناڕاستانەیە، چونکە ئەو کەسانەی دراما پێشکەش دەکەن خۆیان لە ڕاستیدا ژیانی هاوسەرێتیان پڕە لە کێشەو ناخۆشی و زۆرێکیان ژیانیان بە لێك جیابوونەوە کۆتایی هاتووە، با بە هۆی وەها کەسێکەوە ژیانی خۆمان تێك نەدەین، لە کاتێکدا بێگومان ژیانی خۆمان بە دەستی خۆمانە، هەروەك مامۆستا محمد رشید العويد دەڵێت: ((إن الزواج لا يكون جنة إلا بأيدكم، ولايكون جحيما إلا بأيدكم، ولكم أن تختاروا كيف تريدون، أن يكون زواجكم... نعيما أوجحيما.)) واتە: ((ژیانی هاوسەرێتی نابێتە بەهەشت بەدەستی خۆتان نەبێت، هاوکات بەدەستی خۆشتان دەتوانن بیکەنە دۆزەخ!

خۆتان سەرپشکنو دەتوانن ئەوەی ئارەزووی دەکەن هەڵیبژێرن!! کەواتە ئێستا دەتانەوێت کامیان هەڵبژێرن؟؟ حەزدەکەن ژیانی هاوسەرێتیتان بەهەشت بێت، یا... دۆزەخ؟!)).

هۆکاری دووەم: ئەوەیە بەداخەوە کەسانێکی ئاست نزم کاتێك ئافرەتێك دەبینێت لە تەلەفزیۆندا بەشێوەیەکی جوان ڕازانراوەتەوە یا بە پێچەوانەوە ئافرەتێك هونەرمەندێکی پیاو دەبینێت سەرزەنشتی یەکتری دەکەن باسی جوانی ئافرەتێك یا پیاوێك لە لای یەکتری دەکەن کە چەندەها پسپۆڕی شارەزا ئارایشتیان بۆ کردووە تا بەو شێوەیە دەرکەوێت!! پێش ئەوەی بچێتە سەر شاشە، ئەمەش کارێکی زۆر ناشرینە، ئایا ئەو کاتە چ ڕێزو خۆشەویستییەکیان دەمێنێت لەلای یەکتری!

هۆکاری سێیەم: ئەوەیە هاوسەران ناتوانن پێکەوە بدوێنو هەواڵی یەکتری

بپرسن، ڕاو بۆچوونی یەکتری وەربگرنو لە کاروبارەکانیاندا یەکتری ئاگادار بکەن بە هۆی سەرقاڵبوونی بەردەوامیان بە سەیرکردنی تەلەفزیۆنەوە، بە تایبەتی ئەو کەسانەی هەموو بەرنامەیەکیان تەنها تەلەفزیۆنە لە کاتێکدا پێویستە لەسەر هەمووان کات تەرخان بکەن بۆ منداڵ وخوێندنەوەو نووسین و هەربوارێك کە حەزییان لێیەتی.

هۆکاری چوارەم: ئەوەیە زۆرجار جیاوازی حەزو ویستی هەریەك لە ئەندامەکانی خێزان وەك یەك نینو بە پێی ژمارەی ئەندامەکانی دەبێت ژمارەی تەلەفزیۆن هەبێت، لە زۆر ماڵدا دوو تا سێ تەلەفزیۆن هەیەو هەرکەسە دەچێتە ژورێکەوە بۆ سەیرکردنی ئەو فیلم و بەرنامانەی حەزی لێیەتی ئەمەش دەبێتە بەرنامەی شەویان، بە ڕۆژ سەرقاڵی کارکردنو بە شەویش هەرکەس بۆ ژوورێك، ئایا بەم جۆرە شیرازەی تێك ناچێتو ملوانکەی پەیوەندییان ناپچڕێت؟!

هۆکاری پێنجەم: ئەوەیە زۆر ئاگاداری ئەو درامایانە بین کە ئاکارو خووڕەوشت و رۆشنبیرییان لەگەڵ ئێمەدا ناگونجێتو دابو نەریتو ئاکاری جوانمان لە ناو دەبات بە تایبەتی ئەو دراما دۆبلاژکراوانەی کە دەکرێن بە زمانی کوردی، کە بە داخەوە زۆربەی خێزانەکان کاتێکی زۆر بەرامبەر ئەو فیلمانە بە سەردەبەن کە هیچ ڕەوشت و نەریتێکی خۆمانی تێدا بەدی ناکرێت، جگە لە چەواشەکردنی خەڵکی بە شتی بێسوودەوە یا هەندێ بەرنامە پێش کەش دەکرێ بۆ ئەوەی خەڵکی لەسەر پرۆگرامێکی ڕۆژئاوایی خراپ پەروەردە بکرێت لە ڕێگای تەلەفزیۆنەوە.

داوادەکەین کە هاوڕێی تەلەفزیۆن بیت لەشتە باشەکاندا. ڕەنگە زۆر کەس بڵێت باوەڕناکەم بەهۆی تەلەفزیۆنەوە خراپ ببم! یا خووڕەوشتی خراپی لێوە فێر بم! بەڵام ڕاست نییە، هەروەکو شاعیر دەڵێت:

کل الحوادث مبداها من النظر
ومعظم النار من مستصغر الشرر
کم نظرة فتکت فی قلب صاحبها
فتك السهام بلاقوس ولا وتر

گشت ڕووداوێ، سەرەتای بە ڕوانینێکە
ئاگرێکی گەورەش لە پرشەی ئاگرێکە
چەندان ڕوانین دڵی خاوەنەکەی لەتکرد!
بەبێ ژێو بێ کەوانیش تیربارانیان کرد.

لەکۆتایدا داواکارم هەموولایەك سەربەرزو بەختەوەر بن.

# خوێندکارو تاقیکردنەوەکان

ئا: پەیمان بەرزنجی

**پێش تاقیکرنەوە- کاتی تاقیکردنەوە- دوای تاقیکردنەوە...**

لە بیرت نەچێ سوننەتی ژیان وایە، تا هەوڵ نەدەیت پەروەردگار کارت بۆ ئاسان ناکات، وتراوە حەرەکەت نەکەیت بەرەکەتت بۆ نانێرێت!

**پێش تاقیکردنەوە:**

(هۆشمەندی هۆشمەندەکان ئەو کەسەیە کە دەرەنجامی کارەکان بزانێت پێش روودانی، خۆی لێ مەڵاس بدات)· (لوقمانی حەکیم)·

١- پشت بەستن بە خوای گەورە·

٢- متمانە بوون بە خودی خۆت·

٣- دانانی خشتەی تاقیکردنەوە، بزانە کە چەندت کات ماوە بۆ تاقیکردنەوە·

٤- دوورکەوتنەوە لە پێداچوونەوەی بە پەلە· (لە هەر کارێ پەلە بکرێت، کار دانایی تێدا نابێت)·

٥- ئارام گرتن هەبێ لە کاتی خوێندن، هەروەك ناپلیۆن دەڵێت: (ئەگەر دان بە خۆدا گربیت، دەتوانیت بە دەرزی بیر بکۆڵیت)·

٦- خوێندنی رێکوپێك، پێداچوونەوەی رێکوپێك·

٧- هەر شتێك یا تێبینییەکت هەیە پرسیار بکە لە مامۆستاکەت·

٨- دوورکەوتنەوە لە هاورێی خراپ·

٩- پرسیارەکانی ساڵانی رابردوو بخوێنەرەوە، تا سوودی لێ وەرگریت·

١٠- ویستو ئیرادەت بەهێز بێت، لە بەردەم ئەزموون چۆك دانەدەیت·

١١- مێشکی خۆت پرۆگرام ساز بکە، کە تۆ قوتابییەکی لێهاتوویت·

١٢- گەشبین بە، دوورکەوەرەوە لە دڵەراوکێ·

١٣- شەوان زوو نووستنو بەیانیان زوو لە خەو هەستان·

١٤- پێداویستییەکانی تاقیکردنەوە ئامادە بکە، وەك (پێنووس، راستە، لاستیك، قەڵەم دادەر،.... هتد)·

١٥- خوێندنەوەی چەند ئایەتی قورئانی پیرۆز پێش تاقیکردنەوە، لە خودا بپارێینەوەو داوای لێ بکەین سەرکەوتوومان بکات·

١٦- هەرگیز پێش تاقیکردنەوە بە چەند کاتێکی کەم گوێ لە هاورێیانت مەگرە، سەبارەت بەوەی (چی گرنگە، چی دێتەوە)، ئەمە دەبێتە هۆی شێواندنی ئەو زانیارییانەی کە لە مێشکتدا هەیە، چونکە تۆ لە هۆڵی تاقیکردنەوە پێویستت بە مێشکێکی چالاکی هێمن دەبێت·

**لە ناو هۆڵی تاقیکردنەوە:**

وتراوە: (ئەگەر بەدوای جۆگەدا برۆین، دەگەینە دەریا، تۆش پاش بە ماندوو بوونت، دەگەیت بە هۆڵی تاقیکردنەوە)·

١- پشت بەستن بە خوای گەورە·

٢- هیچ مەترسە بیر لە پرسیارەکان مەکەرەوە، وا بزانە ئەو هۆڵە لە تۆ زیاتر کەسێکی تری تێدا نییە، بزانە کە پرسیارەکان هەموویان سووکو ئاسانن هەر ئەو بابەتانەن کە لە کتێبەکەدا هەیە·

٣- پێش دەست پێکردن بە وەڵامە کان ئەم نزایە بخوێنە: (رب زدنی علما)·

٤- هەر کە لەسەر کورسییەکە دانیشتیت، هەناسەیەکی قوڵ وەرگرە، چونکە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی دڵەراوکێو ئارامیت پێ دەبەخشێت·

٥- نووسینی ناوی سیانی لەسەر دەفتەرەکەت پێش هەموو شتێك·

٦- خوێندنەوەی پرسیارەکان زۆر بە وردیو قوڵی·

٧- دابەشکردنی کاتی دیاریکراو بەسەر هەر پرسیارێك·

٨- خۆت مەشڵەژێنە کاتێك هەموو قوتابیان دەنووسن، تۆ جارێ دەستت پێ نەکردووە، پەلە مەکە لە وەڵامدانەوە·

٩- گرنگی دان بە خەت خۆشیو نووسین بە قەڵەمدار، تا لە کاتی هەڵە کردندا بتوانی بیسڕیتەوەو راستی بکەیتەوە·

١٠- سەرەتا وەڵامی پرسیارە ئاسانەکان بدەرەوە، پاشان ئەوانەی کە بەلاتەوە گرانن، بەڵام ریزبەندی پرسیارەکانت لە بیر نەچێ، واتە شوێن بۆ وەڵامی هەر پرسیارێك دابنێ·

١١- گوێ مەدەرە ئەو خوێندکارانەی دەفتەرەکانیان زوو دەدەنە دەست مامۆستا، چونکە زۆربەیان دەفتەرەکانیان بە سپێتی دەدەنە دەست مامۆستا یاخود کەموکورییان هەیە·

١٢- هیچ پرسیارێك بێ وەڵامدانەوە بەجێ نەهێڵی، ئەگەر هیچیشت نەزانی هەر بێ وەڵام تەسلیمی مەکە، لانی کەم شتێك بنووسە، چونکە ئەو مامۆستایەی دەفتەرەکان سەح دەکات نمرەیەك یان زیاتر بۆ دادەنێ·

١٣- بێزار مەبە کاتێك پرسیارت بە بیر نایەتەوە، لە کاتی پێداچوونەوەدا بۆ ئەم پرسیارە چ پەیوەندییەکت دانا بوو بە بیری خۆتی بهێنەرەوە، زۆر زەختیش لە مێشکت مەکە، تا خۆی بە بیریدا دێتەوە·

١٤- شێوازی وەڵامدانەوەت بە کارامەیی بێت، تێگەیشتن لە پرسیار نیوەی وەڵامە، چی داواکراوە بە گوێرەی داوا کردنەکە وەڵامی بدەرەوە·

١٥- دوورکەوتنەوە لە قۆپییەکردن، هۆکارە بۆ شەرمەزاریو دەرکردنی خوێندکار لە هۆڵی تاقیکردنەوە، دەبێتە هۆی دروستکردنی ترسو دڵەراوکێو لە دەستدانی رێزو سەنگی خۆت·

١٦- دوای تەواوکردنی وەڵامەکان،

بەسەریاندا بچۆرەوە، تا لە راستییان دڵنیا بیت، هیچ کاتێك پێش تەواوبوونی کاتی دیاریکراو هۆڵی تاقیکردنەوە جێ مەهێڵە، لەوانەیە لە کاتی کۆتاییدا زۆر شتت بێتەوە یاد.

**دوای تاقیکردنەوە:**

١- گوێ لە هاوڕێکانت مەگرە، وەڵامەکان چۆنەو چیان نووسیوە، کە هەستت کرد هەڵەت کردووە وازی لێبهێنە تا کاریگەری نەبێتە سەر تاقیکردنەوەکانی دواتر.

٢- گەشبین بەو هیواو ئاواتێکی زۆرت بە تواناکانی خۆت هەبێت، نزاو پاڕانەوەش لە خوا داوا بکە.

٣- پاش تاقیکردنەوە بۆ ماوەیەك پشوو بدە، کەمێك بخەوە تا مێشکت بحەوێتەوەو چالاك بێتەوە بۆ تاقیکردنەوەکانی دواتر.

٤- ئەگەر خەوت نەهات پشوو بدە چەند ساتێك چاوەکانت پشوویان پێ بدە، بۆ نموونە سەیری سەوزایی بکە یان ئەو شتانەی دڵخۆشت دەکەن، پاشان دەست بکە بە وانەیەکی تر.

٥- لە کۆتاییدا هیوای سەرکەوتن بۆ هەموو قووتابیان دەخوازین. بە هیوای بە دەستهێنانی نمرەی باشو دوارۆژێکی پرشنگدار.

و. لە فارسییەوە
م. صادق عوسمان - سەرپەرشتیاری پەروەردەیی

رۆژێك باڵوڵی دانا بە لای کۆمەڵێکدا گوزەر دەکات کە سەرقاڵی دروستکردنی بینایەکن لە دوا قۆناغەکانیدا، ماندوو نەبونیان لێدەکاتو دەپرسێت: دەتانەوێت چی دروست بکەن؟

ئەوانیش دەڵێن: مزگەوت. باڵوڵ دەپرسێت: مزگەوت بۆ کێ دروست دەکەن؟ دەڵێن: ئەوە کەی پرسیارە، مزگەوت هەر بۆ خوداو لەبەر رەزامەندی خودا دروست دەکرێت.

ئێمەش هەر بەو مەبەستە کاردەکەین. باڵوڵ کە بەم شێوەیە وەڵامیان دایەوە، بڕیاری دا نیازو مەبەستیان تاقی بکاتەوە، بۆیە بە نهێنی وەستایەکی پەیکەرسازی راسپارد کە لەسەر بەردێکی گەورەی تەخت ئەم نەخشە هەڵکۆڵێت: «مزگەوتی باڵوڵ». نەخشەکە تەواو بوو، چاوەڕێی کرد تا مزگەوتەکەش تەواو کرا، لە شەوێکی تاریکدا لەگەڵ چەند کەسێکدا بەردەکەیان لەسەر دەرگای دەرەوەی مزگەوتەکە چەسپاندو بە جێیان هێشت.

کە بەیانی خۆر بە تیشکە زێڕینەکەی دنیای روونا کردەوە، ئەوانەی مزگەوتەکەیان دروستکردبوو تابلۆکەیان بینی، زۆر ناڕەحەت بوون، ناردیان بە دوای باڵوڵداو بە توندی رەخنەو گازندەیان ئاراستە کردو سەرزەنشتیان کردو وتیان: ئێمە مزگەوتمان دروستکردووەو تۆ ناوی خۆت لەسەر داناوە! ئەمە دەست درێژییە بۆ سەر مافی ئێمە.

بۆیە باڵوڵی دانا رووی تێکردنو وتی: باشە، گەر ئێوە مزگەوتتان لەبەر خوا دروست کردبێت، خۆ خودای بە ئاگا لێی تێك ناچێت، بەڵکو، تەنها خەڵکە وای بۆ دەچن من خاوەنی بم! ئەمە دەیسەلمێنێ کە مەبەستتان رەزامەندی خوا نەبووە «إنما الاعمال بالنيات وإنما لكل إمرى ما نوى».

ناوی کتێب/ كليات جامع التمثيل/ محمد وردی.

ئا: بەرزان ئەبوبەکر

# پێش پچڕانی تەزووی کارەبا!

پێش پچڕانی تەزووی کارەبا داپیرە لە سوچێکی ژوورەکەیدا بە تەنها دانیشتبوو، ئەو کاتەی کوپێك چا، لەگەڵ چەند نانێكو پارچەیەك كێكو خواردن لەسەر تەپڵەکێکی تەختە لە بەردەمی دانرابوو، بۆنی خەمیرەو زیرەو کێك بە نێو ژوورەکەیدا بڵاو ببووەوە.

لە نێو دەمی داپیرەدا پەندو ئامۆژگاری زۆر قەتیس مابوون، چەندین چیرۆکی منداڵان لە بیرو ئەندێشەیدا بوو کە لە باوانی بیستبووی، لەم کاتەدا داپیرە بانگی تاکە تاکە نەوەکانی کرد، بەڵام هیچ کام لەوان وەڵامیان نەدایەوە، چونکە هەر یەك لەوان بە کاروباری تایبەتی خۆیانەوە سەرقاڵ بوون، کورە گەورەکەیان بەرامبەر لاپتۆپەکەی دانیشتووەو بە تەواوی مانا خۆی سەرقاڵ کردووە، هەروەکو ئەوەی لە حاڵەتی جەنگدا بێت لەگەڵ جیهاندا، کچانیش وەکو نەریتی هەمیشەیی خۆیان بەرامبەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان دانیشتوونو چوونەتە قوڵایی ئەو دراما دۆبلاژکراوەی کە بۆتە خولیای زۆرێك لە ماڵەکانو شەوانە چەندین کاتژمێر کاتی زێڕین بەرامبەری بە هەدەر دەدەن... بێ ئەوەی بیر لە ئامانجەکانی ئەو درامایە بکەنەوە...

منداڵە بچۆلانەکەش چووەتە نێو جیهانی یارییەوەو لەگەڵ لەعابە ئەلیکترۆنیەکانیدا یاری دەکات، باوکیشیان بە دوو مۆبایل بەردەوام وەڵامی تەلەفۆنی هاوڕێو هاوکارە بازرگانەکانی دەداتەوە، ئیدی یان تەلەفۆن دەکات یاخود تەلەفۆنی بۆ دەکرێت...

داپیرەش دەستەکانی لەسەر گۆنای خۆی داناو کەمێك بیری لە رۆژانی رابردوی کردەوە، کاتێك نەوەکانی منداڵ بوون هەموویان دەوری داپیرەیان دەداو سەریان دەخستە سەرسنگیو بە دەم گوێگرتن لە چیرۆکە خۆشەکانی داپیرەوە خەو دەیبردنەوە، بەیانیان زوو لەسەر خوان لە دەوری کۆدەبوونەوەو چاوەڕێیان دەکرد داپیرە بە دەستە خاوێنەکانی چایان بۆ تێ بکاتو پێکەوە نانی بەیانی نۆش بکەن...

بەڵام ئەمرۆ بە تەنها لە ژوورەکەی خۆیدا دانیشتووەو هیچ کام لە نەوەکانی لە دەوری نەماونو بەشداری دانیشتنەکانی ناکەنو لەسەر سنگی داپیرە ناخەونو... هتد. ئەمەش ژیانی زۆرێك لە داپیرەکانی ئەمرۆیە...

لەم کاتەدا جارێکی تر داپیرە بانگی کردنەوە، بەڵام ئەمجارەشیان نائومێدیو بێتاقەتی بوویە میوانیو کەس لەوان لەبەر سەرقاڵی خۆیان گوێبیستی دەنگی داپیرە نەبوو، نەیان دەزانی داپیرە چەند پێویستی بە دانیشتنو گفتوگۆکردن هەیە لەگەڵ نەوەکانیدا!

لە ناکاو تەزووی کارەبا پچڕاو تاریکی باڵی کێشا بە نێو ماڵەکەدا، تێکڕای گڵۆپو سورەییەکان خامۆش بوون... ئیدی تاریکیو بێدەنگیو چاوەڕوانی بە هەموو نێو ماڵدا بڵاوبووەوە...

لەم کاتەدا باوکیان هاتو لە ژوورەکەی داپیرەدا مۆمێکی داگیرساندو ژوورەکەی رووناك کردەوە، ئەوانیش بە هەڵەداوان بەرەو رووی ژوورەکەی داپیرە هاتنو لە دەوری داپیرە کۆبوونەوە.

هەموو کۆمپیوتەرو یاریو شاشەی تەلەفزیۆنەکان بە هۆی پچڕانی تەزووی کارەباوە خامۆش بوون، بە ناچاری جێیان هێشتبوون، رووناکی ئەو تاقە مۆمە بووە میحوەری گرنگیدانی هەمووان...

هەموو لەسەر ئەو خوانە کۆبوونەوە کە بۆ داپیرە دانرابوو، لەبەر رووناکی مۆمەکە دەستیان کرد بە نانخواردن لەگەڵ داپیرەدا، کورە گەورەکەیان لە داپیرە نزیك بووەوەو دەستی کرد بە باسکردنی هەموو ئەو گرفتانەی لە کارە نوێیەکەیدا تووشی هاتووە...

کچە گەورەکەشی باسی پرۆژەی ئاهەنگی دەرچوونی خۆی بۆ داپیرە گێڕایەوە...

لەم کاتەدا کورە گەورەکەی سەرنجیدا داپیرە لە خواردنەکە نزیك نابێتەوەو نان ناخوات...

کاتێك پرسیاری لێکرد لە هۆکاری نان نەخواردنی؟

وەڵامی دایەوەو وتی: ددانەکانم ئازاریان هەیەو تەندروستیم تەواو نییە...

سەرەتا کورەکەی وایزانی داپیرە بە دەست گرفتێکەوە دەناڵێنێت!

هەر بۆیە لێی نزیك بوویەوەو دەستەکانی گرتو کەمێك بە شەرمەزارییەوە لێی پرسی: چەندێکە گیرۆدەی ئەم ئازارە بوویت؟

ئەم پرسیارە بەس بوو بۆئەوەی داپیرە کەمێك دەردە دڵی خۆی بکات، مۆمەکە بەردەوام بوو لە بەخشینی

ڕووناکی‌و توانەوەی لە پێناوی دەوروبەرەکەیدا، گفتوگۆی نێوان داپیرەو نەوەکانیشی بەردەوام بوو، مۆمەکە بەرەو کۆتایی دەچوو، کوڕە گەورەکەی ڕۆیشت بۆئەوەی مۆمێکی تر بهێنێت، بەڵام پێش گەڕانەوەی، کارەبا هاتەوەو نێو ماڵەکەیان ڕۆشن بوویەوەو ئامێرە کارەباییەکان وەکو تەلەفزیۆن‌و کۆمپیوتەرو... داگیرسانەوە، بە خێرایی هەر یەك لە ئەندامانی خانەوادە گەڕایەوە لای ئامێرەکەی خۆی، یەك بۆسەر ئینتەرنێت‌و یەکی دی بۆ تەماشا کردنی دراماو... هتد.

داپیرە جارێکی تر تەنها مایەوە... ئەندامانی خێزان بە هاتنەوەی کارەبا چوونەوە سەر ئامێرەکانی خۆیان... کەس لەوان نەیان دەزانی کە باوکیان کارەباکەی کوژاندبۆوە، هەر ئەویش جارێکی تر کارەباکەی هەڵکردبووەوە.

ڕەنگە زۆرێك لە ئێمە هەمان مامەڵەو هەڵسوکەوتمان هەبێت لەگەڵ باوان‌و داپیرەو باپیرەدا، کەواتە با پێکەوە بەڵێن بدەین ئیدی لەمەودوا ئەوەندە تەنها جێیان نەهێڵین، چونکە ئێمە لە منداڵیدا چەندە پێویستمان بە میهری ئەوان بوو؟ چۆن چاوەڕێمان دەکرد ڕۆژانە دەستی سۆزو میهرەبانی بەسەرماندا بهێنن؟ ئێستا ئەوان پێویستیان بە میهرو سۆزی ئێمە هەیە، ئەوان چاوەڕوانن ئێمە دەستی میهرەبانی بە سەریاندا بهێنین، لە چاوەڕوانیدان کاتێك ئێمە لەسەر کار دەگەڕێینەوە سڵاویان لێ بکەین‌و سۆزو میهرەبانی‌و خەندەیان پێشکەش بکەین... دەبا ئێمەش لە دەربڕینی سۆزو میهرەبانی‌و خۆشەویستی بۆ ئەوان چیدی کەمتەرخەمی نەکەین!

دەبا سەرقاڵبوونمان بە دنیاوە نەبێتە هۆی فەرامۆش کردنی ئەوان... با چیدی کاروبارەکانی ژیان بارودۆخ‌و کەشی گەرمی دانیشتنە خێزانییەکان تێك نەدەن!

گەر دەتەوێت هەست بە خۆشی‌و شادی‌و نرخی ژیان بکەیت، ئەوا ڕێزی نیعمەتەکانی خوداوەند بگرە!

بێگومان یەکێك لە نیعمەتە گەورەکانی خودا بۆ ئێمە دایك‌و باوك‌و داپیرەو باپیرەن، کەواتە پێش ئەوەی لە دەستیان بدەین با چاکەیان لەگەڵدا بکەین‌و دڵخۆشیان بکەین‌و هەمیشە نزای خێریان بۆ بکەین...

تا زیندوم گوڵم بۆ بێنە بە دیاری
کە مردم گوڵم بۆچییە لە جێی نادیاری.

ڕاوکەرێك هێندە جوان نیشانی لە دایك‌و بێچویەك گرتبوو، کە ئەسرینی چاوەکانی هێدی هێدی گەواهی دوا تروسکایی ژیانی بۆ ئەوان نیشان دەدا، دەیویست بەو دڵۆپە فرمێسکانەی دەیانخاتە سەر گۆڕەپانی کوڵمەی دوایین گەرماوی ماتەمینیان بۆ ساز بکات‌و بۆ ئەو دونیا ئەسپەردەیان بکات.

کەچی بێچووەکە هێندە شەیدای فرمێسکە بە خوڕەکانی پیاوەکە ببوو کە عەودال‌و مەستی کردبوو، بۆیە بە ئەسپایی چرپاندی بە گوێچکەی دایکیداو گوتی: دایکە بڕوانە ئەم پیاوە چەندە بە بەزەییە خەریکە گۆنای بە فرمێسکی دڵنەوایی بۆ ئێمە تێر ئاو دەکات! دایکە چرپاندی بە گوێی بێچوەکەیداو گوتی: ڕۆڵە ڕاستە فرمێسك دەڕێژێ، بەڵام لە دواییدا هەر ئەم فرمێسکە بۆ ئێمە دەبێتە لافاوو لەگەڵ تەوژمو شەپۆلە سەختەکانی خۆی بە خاکمان دەسپێرێت، ڕۆڵەی ئازیزم تۆ لە ڕواڵەتو نیگا جوان‌و غەمگینەکەی مەڕوانە، بەڵکو سەیری کردارەکەی بکە کە خەریکە پەلەپیتکەی چەکەکەی دادەگرێت‌و لەگەڵ فرمێسکەکانی خۆی ئێمەش بۆ هەمیشە قەتیس دەکات، کە ئەسرین دەبارێنێت بۆ ئێمە نییە، بەڵکو بۆ ئەوەیە جوانتر نیشانی خۆی بپێکێ، ڕۆڵەی شیرینم لە یادنەکەی کە مرۆڤ بە کردارەکانی پێناسە دەکرێت، نەك بە ڕواڵەتو سیمای!

لەم پەیڤەوە فێردەبین:

١- بڕیارەکان وەك ئەو دڵۆپە فرمێسکانەن کە ئەگەر بێ ئاگابیت لێیان دەبن بە تراژیدیاو زریانێکی ڕووخێنەر بۆ کەسایەتیت هەڵدەگیرسێنن.

٢- هەمیشە نیگای خەڵکی ڕووەو کردارەکانمان دەبێتەوە نەك سیماو ڕواڵەت، بۆیە با کردەوەکانت سەرچەشمەیەك بن بۆ بەرجەستەکردنی وتە جوانەکانت.

٣- بزانە کەسانێك هەن سیما جوان‌و دڵنەرم ئاسا دەتبینن، بۆیە تۆش لە ئاست ئەم تێڕوانینەی ئەواندابەو گورگی ناو پێستی مەڕ مەبە.

٤- بەردەوام لە ئاست بەرپرسیارییەتیدا بە، وەك دایکەکە بۆ بێچووەکەی، نەك بە سوێراتی فرمێسکەکانت ئاوی شیرینی ژیان لە خەڵکی تفت‌و تاڵ بکەیت‌و هاوتای ڕاوچییەکە هەڵگری فرمێسکی بە خوڕو تامێکی بێزراویش بیت.

٥- بەردەوام هەڵگری پەیامی ئاشتی‌و نەفرین لە کوشتارو دوژمنکاری بە، ژەنیاری سەمفۆنیای خۆشەویستی‌و ژانی دەمی کوژکاری بە.

# شێوازێك لە شێوازەكانی پەروەردەی منداڵ

زۆرێك لە خەڵكی لە شێوازو چۆنییەتی پەروەردەكردنی منداڵەكانیان سەراسیما دەبن، كەوا چۆن بتوانن منداڵەكانیان ڕێنمایی بكەن بۆ لایەنی باش، بێئەوەی ئەو هۆكارو ڕێگەیەی بەكاری دەهێنن هەڵەی تێدابێت، لەوانەیە ئەم شێوازەی پەروەردەی منداڵ بە ناوی (پەروەردە لە خولەكێكدا) پێشنیارێكی هاوسەنگ بێت.

شێوازی (یەك خولەك) شێوازێكی نوێیە لە بواری پەروەردەكردنی منداڵاندا، ئەگەر بە دەست سەرەڕۆییو لاساریی منداڵەكانت دەناڵێنی یان هەست بە بوونی گرفتێك دەكەیت لە شێوەو ڕێگەی پەروەردەكردنی منداڵەكانت؟ هەوڵ بدە شێوازی (یەك خولەك) بەكاربهێنی لە پەروەردەكردنیاندا، پاشان تێبینی بكەو بزانە تا چەند ئەم شێوازە سەركەوتوو دەبێت لەگەڵیاندا.

لە سەردەمی نوێدا دكتۆر (سبنسەر جۆنسۆن) بە ڕێبەری شێوازی (یەك خولەك) دادەنرێت، ئەم شێوازەی پەروەردە، پشت بەوە دەبەستێت كە منداڵەكان وا لێبكات بە هەڵسوكەوتی هەڵەی خۆیان ڕازی نەبن، بەڵام لە هەمان كاتیشدا ڕەزامەندبن لە خودی خۆیان، واتە لۆمەی خودی خۆیان نەكەن، بەڵكو هەڵسوكەوتە هەڵەكەی خۆیان قبوڵ نەكەن، با بزانین ئەمە چۆن لە تەنها خولەكێكدا ئەنجام دەدرێت؟!

ئەگەر منداڵەكەت لە كاتێكی درەنگدا گەڕایەوە ماڵەوە، بۆ چەند جارێكیش لە هەفتەیەكدا ئەمەی دووبارە كردەوە، بۆ ئاگاداركردنەوەی لەم هەڵەیەیو ڕاستكردنەوەی، بە هێمنیو ڕاستەوخۆ چاوەكانت ببڕە ناو چاوەكانیو پێی بڵێ: (ئەمڕۆ درەنگ گەڕایتەوە ماڵەوە، ئەوە بۆ دووەم جاریشە لەم هەفتەیەدا ئەمە دووبارە دەكەیتەوە)، پاشان وا پێویست دەكات ڕاستی هەستكردنی تووڕەبوونی خۆتان دەربڕنو پێی بڵێن: (كوڕەكەم- ڕۆڵەكەم من زۆر لە تۆ دڵگرانم، هەروەها من زۆر دڵتەنگم، چونكە تۆ ئەوە بۆ دووەمین جارە ئەمە دووبارە دەكەیتەوە).

ئەوەی گرنگ بێت لەم كارەدا ئەوەیە كە تۆ لە نیوەی یەكەمی خولەكەكەدا دەتەوێت منداڵەكەت هەست بەوە بكات كە تۆ هەستی پێدەكەیت، كەوایە هەر تەنها سەرزەنشتو سەركۆنەكردنی منداڵەكانمان بەس نییە، بەڵكو گرنگ ئەوەیە هەستی پێ بكەن. منداڵەكەت دوای ئەم گفتوگۆ كورتەی تۆ لەگەڵیدا، هەست بەو هەستەی تۆ دەكات لە بەرامبەر هەڵسوكەوتەكەیو تێدەگات كە تۆ حەز لەم كارەی ناكەیت. لەوانەشە هەست بە ڕق لێبوونەوەیەكیش بكات لە بەرامبەرتاندا، چونكە هیچ یەكێك لە ئێمە حەزناكات كەسێك سەرزەنشتی بكات، ئەمەش ڕێك ئەوەیە كە تۆ لە نیوەی یەكەمی خولەكەكەدا دەتەوێت، تۆ دەتەوێت منداڵەكەت هەست بەوە بكات كە نائاسوودەیە، بەڵام چی دەكەیت ئەگەرهاتوو منداڵەكەت هەستی بە بێزاری كردو دەستیكرد بە پارێزگاریكردن لە خۆی؟ لێرەوە پێویست دەكات نیوەی دووەمی خولەكەكە تەواو بكەیت، چونكە ئەمەیە كلیلی سەركەوتنی پرۆسەی سەرزەنشتكردنەكە كە ئەنجامی دەدەیت.

تۆ لە نیوەی یەكەمی خولەكەكەدا بە منداڵەكەت ڕاگەیاند كە تۆ لێی ڕەنجاویو خەمباری بە هۆی ڕەفتارە هەڵەكەیەوە، لە نیوەی دووەمی خولەكەكەشدا تەماشای نێوچەوانی بكەو وای لێبكە كە هەست بەوە بكات تۆ لەگەڵ ئەودایت نەوەك لە دژی، هەروەها ئەوەی پێ بڵێ كە ئەو (منداڵەكە) دەیەوێت لە تۆوە گوێی لێبێت، پێی بڵێ كە ئەو كەسێكی باشو چاكە، تۆش خۆشتدەوێت، بەڵام تۆ لەو ڕەفتارەی ڕازی نیت كە ئەم شەوە ئەنجامیداوە، ڕەفتارەكەی ئەو تۆی هەراسانكردووە، پاشان بە توندی لە باوەشتی بگرە تاوەكو پێی پیشان بدەیت كە سەرزەنشتكردن كۆتایی هاتووە، بێئەوەی ئەمە باس بكەیت.

بەمشێوەیە تۆ لە نیوەی یەكەمی خولەكەكەدا بەخێرایی هەستای بە سەرزەنشتكردنی منداڵەكەت، ئەوەت بۆ دەستنیشانكرد كە ئەنجامیداوە، گوزارشتت لە هەستی دڵڕەنجانی خۆت كرد لە بەرامبەر ئەو هەڵەیەی ئەنجامیداوە، بەڵام نیوەكەی دیكەی خولەكەكە، بریتی بوو لە چەند ساتێكی هێمنیو خۆشەویستیو متمانە پێدان، لە میانی خولەكێكدا ئەوەت پیشاندا كە تۆ ڕەفتاری ئێستای منداڵەكەت قبوڵ نییەو پێی ڕازی نابیت، بەڵام لە هەمان كاتیشدا ئەوەشت پیشاندا كە ئەو منداڵێكی چاكە، وات لێكرد هەست بەوە بكات تۆ خۆشتدەوێتو لە باوەشی دەگریت. بەم ڕێگەیەش منداڵەكان هەست بەوە دەكەن كە حیسابو لێپێچینەوە بۆ هەڵسوكەوتە خراپەكانیان دەكرێتو لە هەمان كاتیشدا ئەوان وەكو خودی خۆیان كەسانێكی چاكو خۆشەویستن.

خولەكێكیش بۆ ستایشكردن

ئەگـەر منداڵەکەت کارێکی ئەنجامداو شایستەی پیاهەڵدانو ستایشکردن بێت، تۆ وای لێبکە کە ئەگەر کارێکی چاکی ئەنجامدا هەست بە خۆشی بکات، هەروەك چۆن کاتێك هەڵەو خراپەیەکی ئەنجامدا تۆ سەرزەنشتت کرد، تێبینی منداڵەکانت بکە کاتێك هەڵسوکەوتی جوان دەکەن، بە شێوەیەکی ڕوونو دیار پێیان بڵێ: کە چ کارێکی چاکیان ئەنجامداوە. دڵخۆشی خۆتیان پێ ڕابگەیەنە لەوەی کە کردوویانە، بۆ چەند چرکەیەکیش لە قسەکردن بووەستە، بێدەنگییەکەت وایان لێدەکات هەست بکەن کەوا ئەوان ڕازین لە بەرامبەر خۆیاندا، ستایشو مەدحکردنەکەت بە لە باوەشگرتن یان بە دەست خستنەسەر شانێکی سۆزدارانە کۆتایی پێبهێنە، تاوەکو ئەو هەستەی لە لا دروست بکەیت کە تۆ گرنگیو بایەخ بەو دەدەیت، ئەگەرچی ستایشو پیاهەڵدانی منداڵەکانت زیاتر لە خولەکێك ناخایەنێت، بەڵام هەستکردنیان بە ڕەزامەندبوون لە خودی خۆیان بە درێژایی ژیانیان لەگەڵیاندا دەمێنێتەوە.

هەوڵبدە لە کۆتایی پشووی هەر هەفتەیەك لەگەڵ منداڵەکانت دابنیشیت، پرسیاریان لێبکە ئایا دەیانەوێت چۆن پشووی هەفتەکە بەسەر ببەن؟ لێیانگەڕێ با پلانێك دابنێن کە ئامانجەکانیانی تێدا دەستنیشان بکەن، هەروەها ئەوەی دەیانەوێت لەم پشووەدا ئەنجامی بدەن. ئەم ئامانجانە کۆبکەوەو لێیانگەڕێ بۆ ماوەی خولەکێك سەیری بکەن، پاشان هەریەکێکیان خۆی دەبینێت تا چەند ئامانجەکان لەگەڵ ڕەفتارەکانیان دەگونجێت، بۆ نموونە لەوانەیە یەکێك پلانێك دابنێت تێیدا شێوەی قسەکردنی لەگەڵ کەساندا ڕێکبخات، بۆیە دەیەوێت بە دەنگێکی بەرز قسە نەکات نەوەك دەوروبەرەکەی هەراسان بکات. لەوانەیە یەکێکی تر ئامانجەکەی ئەوەبێت شێوەی ڕۆیشتنی بە ڕێگادا ڕاست بکاتەوە، لە کاتێکدا ئەگەر زانی شێوازی ڕۆیشتنەکەی ئاسایی نییە، ئیتر بەم شێوەیە.

هەر ئەندامێك تەماشای ئامانجە تایبەتییەکانی خۆی دەکاتو تێبینی دەکات کە تا چەند شێوازەکەی هاوکۆك دەبێت لەگەڵ ئامانجەکانیدا، ئەمەش لە خولەکێك زیاتر کات نابات. ئا بەمجۆرە منداڵان هەست بە باوەڕ بە خۆبوونو توانای بەڕێوەبردنی کاروباری ژیانی ڕۆژانە دەکەن، بەمەش ژیانیان زیاتر ڕۆشن دەبێتەوەو دەگەشێتەوە.

ژمارەیەکی زۆر لە باوکان ئەم ڕێگەیەیان تاقیکردۆتەوەو تێیدا چارەسەری گرفتەکانی پەروەردەکردنی منداڵەکانیان دۆزیوەتەوە، هەروەها لە کاتێکی کەمدا ئەنجامی باشتریان بەدەستهێناوە. منداڵەکانیان فێری ئەوەبوون چۆن خۆیان خۆشبوێتو هەوڵبدەن بۆ پێشخستنی باشتری ڕەفتارەکانیان، هەروەك هەستیان بە تامو چێژی ژیانێکی خۆش کردووە لە ماڵێکی دوور لە ڕقوکینەدا.

(دە) ئامۆژگاری بەسوود لە پەروەردەکردنی منداڵدا:

* خۆت تەنها بە ئامانجو ئارەزووەکانت خەریك مەکەو کێشەکانی منداڵەکانت لە بیر بکەی.
* بەرپرسیارییەتی پەروەردەکردن هەر بە تەنها مەخەرە سەر شانی هاوسەرەکەت.
* هەوڵبدە کاتێکی پێویست لەگەڵ منداڵەکانت بەسەرببەی، لەگەڵ هەستو کێشەکانیان بژیت.
* کاتێك سەرکۆنەو سەرزەنشتی منداڵەکەت دەکەیت، لە بیرت بێت وەهای لێبکەیت کە تۆ ئەوت خۆشدەوێت، بەڵام حەز لە ڕەفتارەکەی ناکەیت. هەرچەندێك منداڵەکانت خۆیان خۆشبوێت، ئەوەندە هەوڵدەدەن ڕەفتارەکانیان بەرەو باشتر ببەن.
* لەسەر باوکان پێویستە فێری ئەوە ببن کە گوێ لە منداڵەکانیان ڕابگرن، تاوەکو منداڵەکانیش فێربن چۆن گوێ لە باوکەکانیان ڕابگرن.
* هەوڵبدە هەر لە تەمەنی زوویاندا هەستی سەرکەوتن لە ناخی منداڵەکانت گەشە پێبدەیت، وایان لێبکە هەڵسوکەوتە باشەکانیان پێ بزانن و ببینن، کاتێکیش بەشێوەیەکی باش هەڵسوکەوت دەکەن، مەدحو ستایشیان بکە.
* هانی منداڵەکانت بدە کەوا هەردەم لەگەڵتدا ڕاستگۆبن.
* کاتێك لە ماڵەوەی، هەوڵبدە تەنها بیر لە کاروباری ماڵو منداڵەکانت بکەیتەوە، کاتێکیش لەسەر کاری تەنها بیر لە کارەکەت بکەیتەوە.

-ئەگەر بینیت منداڵەکەت سەرپێچیت دەکات، ئەوا لە خۆت بپرسە: ئایا ئەمڕۆ منداڵەکەت لە باوەش گرتووە؟

* لە پەروەردەکردنی منداڵەکانتدا، پەیڕەوی لە شێوازی (یەك خولەك) بکە، سەرزەنشتکردن لە خولەکێکداو ستایشکردن لە خولەکێکدا، بەڵام خولەکێکی بە سوودو بەرهەمدار.

سەرچاوە: د. حسان شمسی باشا.
www.balagh.com

# بۆئەوەی هاوڕێکانت لە دەست نەدەیت

دەشتی نوری ڕەشید

دیاریکردنی گلەییەکانت:

1 دەبێت گلەییەکانت لە سنورێکی دیاریکراو بێت تایبەت بێت بە بابەتێك، بە وتەکانت نائومێدو دلگران نەبێت، خۆت دوور بگرە لە دووبارەکردنەوەیان تاکو نەبێتە هۆی دارمانی دەروونی.

ڕاستەوخۆ تاوانباری مەکە:

2 هاوڕێکانت لە بازنەی تاوان دووربخەرەوە، ناچاری مەکە بۆ پارێزگاریکردن لە خۆی وانیشاندا کە بێتاوانە لەوەی کە کردوویەتی، تا نەبێتە هۆی نەمانی پەیوەندی نێوانتان.

خاڵ لەسەر پیتەکان دابنێ:

3 کاتێك گلەیی لە هاوڕێیەکت دەکەیت دەبێت دەستنیشانی خاڵە لاوازو بەهێزەکانی بکەی، ئەمەش بۆ مانەوەی ئەوپەیوەندییە پتەوەی نێوانتان، نەبێتە هۆی تێکچوونی پەیوەندییەکەتان.

کەسێکی بەڕێزبە:

4 بە هیچ جۆرێك وشەی نادروستو دوور لە ڕەوشتی جوان بەکارمەهێنە، تاکو نەبێتە هۆی بێزاری هاوڕێکەت، چونکە وشە ناشرینەکان لە دڵ دەرناچن.

کەسێکی هێمن بە:

5 دەنگت بەسەریدا بەرز مەکەرەوەو بەشێوەیەکی هێمنو لەسەرخۆ دوور لە هەڵچوون بدوێ لەگەڵیدا.

شکاندنەوە:

گلەییەکانت هەڵگرەو لە ناو خەڵکیدا 6 ئاراستەی مەکە. دوور لە چاوی هاوڕێکانیو لە شوێنێکی هێمن پێی بڵێ، بزانە تۆ گلەیی لێدەکەی نەوەکو شەڕ، گلەییەکانت بنیاتنەر بێت نەوەك ڕووخێنەر.

سەرچاوە/ ماڵپەری بورسات

# نیگەران مەبە کێشەکان ئەوەندە گەورە نین

ن: دیل کارنگی

لێرەدا لە ڕێی ئەم چیرۆکەوە پێشنیارێکت پێشکەش دەکەین بۆ ئەوەی چیتر نەهێڵیت خۆرەی نیگەرانی گیانت بهارێت. چونکە هەروەك «پۆدولسکی» لە کتێبەکەیدا دەڵێت: فشاری خوێن بە هۆی نیگەرانییەوە سەر هەڵدەدات!

بۆی هەیە رۆماتیزم دەستکەوتی راستەوخۆی نیگەرانی بێت!

«گلن لیچفیلد» بەڕێوەبەری یەکێك لە کۆمپانیا بە ناوبانگەکانی رۆژهەڵاتی ئەمریکا بوو لەو ساڵەدا کە یابانییەکان فەرمانڕەوایی «شانگهای»یان دەکرد «لیچفیلد» لە چین دەژیا، داستانەکە لە زمانی خۆیەوە:

( ... لە هێرش بۆ «پرل هارت» ماوەیەکی زۆر تێپنەڕی بوو کە یابانییەکان رووەو شانگهای بەڕێکەوتن. لەو کاتەدا من بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی «بیمە» بووم لە شانگهای، لە لایەن دەوڵەتی یابانەوە فەرمانبەرێك بە حەواڵەکردنی حسابی کۆمپانیا دامەزرا، کە ئەم کەسە «دەریا سالار» بوو، فەرمانیان بە من کردبوو: کە باشترین هاوکاری لەگەڵ ئەودا بکەم، هەڵبەتە پێیان راگەیاندبووم کە لە هاوکاری کردنی درێغیو کەمتەرخەمی نەکەم.

دوو رێگە زیاترم لە بەردەمدا نەبوو: یا دەبوایە بۆ هاوکاری ئەو خۆم تەرخان بکەم یا مردنم هەڵبژاردایە، چارەیەکیش جگە لە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی فەرمانڕەوای سوپای یابان نەبوو، تەنها کارێك کە توانیم بە سوودی کۆمپانیا ئەنجامی بدەم ئەوەبوو کە بە هەڵە نامەیەکی (٧٥٠) هەزار دۆلاریم بۆ «دەریا سالار» لە قەڵەمدا. بیانووم ئەوەبوو کە ئەو بڕە پەیوەندی بە کۆمپانیایەکەوە هەیە لە (هۆنگ کۆنگ) بەڵگەیەك نییە ئەو بڕە بە حسابی کۆمپانیا لە شانگهای لەبەرچاوبگرم!

هەڵبەتە دەترسام کە یابانییەکان لەم کارەی من بەئاگا بنو تووشی دەردەسەرییەکی ترسناك ببم.. لە راستیدا ترسەکەم لە جێگەی خۆیدابوو ئەوەی لێی دەترسام بەسەرم هات، بەڕێوەبەری کۆمپانیا رۆژی یەکشەممە پێی راگەیاندم کە بە ئامادەنەبوونی من دەریا سالاری یابانی لەم کەینو بەینە گەیشتووەو ئەوەندە تووڕەیە لە تاواندا خۆی پێچ دەدات. دەریا سالار رایگەیاندووە کە من ناپاکیم لە دەوڵەتی یابان کردووە. من بە باشی لە سزای کەسێك کە لە دژی دەوڵەتی یابان هەنگاو هەڵگرێت بە ئاگا بووم، دەمزانی شوێنی ئەو کەسانە بەندینخانەی «بریج هاوس»ە.

بریج هاوس جێگەی ئەشکەنجەدانی کاربەدەستانی یابان بوو، هەندێك لە دۆستەکانم پێش ئەوەی بکەونە نێو ئەم بەندینخانەیەوە خۆیان کوشتووە هەندێکی تریشیان دوای دە رۆژ لێپرسینەوەو ئەشکەنجەدان پەیوەندییان بە ئەوانەوە کردووە.

ئێستە منیش ناوم لە ریزی ئەو زیندانیانەدا نووسراوە!! بۆ دەربازبوونم دەبوایە چیم بکردایە؟ ئێستا دەیهێنمەوە بیری خۆم کە ئەگەر لەو حاڵەتەدا رێگەیەکی چارەسازی کاریگەرم نەدۆزیبایەتەوە چەند گیرۆدەی ترسو دژواری دەبووم، ساڵانێك بوو کە هەر کاتێك لە کارێکدا دووچاری نیگەرانی دەبووم راستەوخۆ روو بە دەزگای چاپ دەڕۆشتمو ئەم پرسیارانەم چاپ دەکرد:

١- چ شتێك منی نیگەران کردووە؟

٢- دەتوانم چ شتێك لەو بارەیەوە ئەنجام بدەم؟

پێش ئەم قۆناغە بێئەوەی پرسیارەکان بخەمە سەرکاغەز هەوڵم دەدا وەڵامێکیان بۆ بدۆزمەوە، بەڵام دوایی تێگەیشتم کە نووسینی پرسیارو وەڵامەکان لە بەرامبەریدا یارمەتی بیرکردنەوەم دەدەن.

بەم ئەزموونە بوو کە رۆژی یەکشەممە رووەو ژوورەکەم لە ئەنجومەنی گەنجانی مەسیحی رۆیشتم، لە پشت مێزی دەزگای چاپەکەوە دانیشتمو بە فشاردانی دوگمەکانی نووسیم:

١- چ شتێك منی نیگەرانکردووە؟

ترس لەوەی کە سبەی بەیانی بمخەنە

نێو بەندینخانەی «بریج هاوس»·

نۆبەتی پرسیاری دووەم هات:

٢- دەتوانم چ شتێك لەو بارەیەوە ئەنجام بدەم؟

دوای چاپکردنی پرسیاری دووەم چەند کاتژمێرێك بیرم کردەوە تا پەیم بە چوار ڕێگەی چارەساز برد· چوار ڕێگەکەم لەگەڵ ئەنجامەکانیدا نووسی:

أ- دەتوانم چاوم بە دەریا سالار بکەوێتو ڕێگری لە هەنگاوەکانی بکەم· گرفت ئەوە نییە کە زمانی ئینگلیزی نازانێت ئەگەر بمەوێت بە هۆی وەرگێڕێکەوە قسەی لەگەڵدا دەکەم، بەڵام لەوانەیە دووبارە تووڕە ببێتەوەو کە ئەم کارەش ئەنجامێکی جگە لە مردن نییە· بەو خوو نەریتە خەشمەی کە من دەیزانم لەو بە دوور نییە کە گوێ بۆ قسەکانم رانەدێرێتو راپێچی بەندیخانەم بکات·

ب- دەتوانم هەڵبێم! ئەمەش گونجاو نییە، چونکە دەمخەنە ژێر چاودێرییەوەو بە زوویی دەستگیرم دەکەنو لە سێدارەم دەدەن·

ج- هەر لەم ژوورەدا دەمێنمەوەو ناڕۆم بۆ کۆمپانیا، ئەمەش هەر بێ سوودە! چونکە دەریا سالار بە ئامادە نەبوونم بە گومان دەبێتو دەنێرێت بە دوامداو لەو کاتەدا بەبێ دادگایی کردن رەوانەی بەندینخانەم دەکات·

د- وەکو پیشەی هەمیشەیی سبەی بەیانی دەڕۆم بۆ کۆمپانیا! لەوانەیە دەریا سالاری یابانی بە هۆی گرفتاری زۆرەوە ئەم بابەتەی لە بیرکردبێ، ئەگەر لە بیریشی نەکردبێ بە تێپەڕبوونی شەوێك ئارام بۆتەوەو من پێش ڕوودانی کارەسات دەتوانم رازی بکەم·

دوای سەرنج دانی تەواوم لە هەرچوار ڕێگە چارەسازەکە ڕێگەی چوارەمم هەڵبژارد·

ڕۆژی دوایی بەیانی زوو وەك هەمیشە رۆیشتم بۆ کۆمپانیا· بە ئارامیو بێ شڵەژان چوومە ناو ئیدارەوە، لە ژووری بەڕێوەبەردا دەریا سالاری یابانی کە جگەرەیەکی بە لا لێوەوە بوو وەك پیشەی هەمیشەیی سەرگەرمی کارکردن بوو· دەریا سالار بێ ئاماژەکردن بە بابەتی رابردوو سەری قسەی دامەزراند· ئەو رۆژە سەبارەت بە هەرشتێك قسەمان کرد جگە لە ئاماژەکردن بە بابەتی رابردوو· وەك ئەوەی کە هیچ نەبووبێ ئەو رۆژە بە خۆشی کۆتایی پێ هات· دەریا سالار دوای شەش هەفتە لە تۆکیۆوە بانگهێشت کراو نیگەرانییەکانی من بە تەواوی لە ناوچوو· بەم شێوەیە بوو کە بە وردی سەرنجێکی ئەوتۆوە لە ڕۆژی یەك شەممەدا بڕیارم داو توانیم ژیانی خۆم بپارێزم· ئەگەر بێ ئۆقرەو بە هەڵەشەیی دەست بەکاربوومایە هەڵەیەکی گەورە رووی دەدا کە سەرەنجامەکەی مەرگ بوو، هەتا ئەگەر ئەو شەوەم دێوانە ئاساو بە شڵەژاوی تێپەڕاندایە خەو نەدەهاتە نێو چاوانمو سبەی بە ڕواڵەتێکی نیگەرانو شڵەژاوییەوە دەچووم بۆ کۆمپانیا، ئەوەندە بەس بوو بۆ دەریا سالار بە گومانی خراپ لە من تێ بگاتو هەر ئەو گومان خراپییە ئەوی لە دژی من هەڵدەنا)·

«گلن لیچفیلد» تا ئەم دواییانەش بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی گەورەی بیمەو کاروباری دارایی بوو، ئەم کەسە لە بەناوبانگترین خاوەنی کارە ئازادەکانی ئەمریکا بوو لە ئاسیادا، خۆی بە راشکاوانە وتوویەتی کە بەشێك لە سەرکەوتنەکانی خۆی بە قەرزاری رەوشی شیکارکردنو تەحلیلی نیگەرانی دەزانێت·

لەم چیرۆکەوە ئەوە فێردەبین کە تەحلیل کردنی نیگەرانی دەمانگەیەنێت بە ئاسوودەییەك کە جێگەی باوەڕ نییە!

ئەگەر دەپرسیت بۆچی تا ئەم رادەیە؟!

سەرنجی ئەم وەڵامەی «دیل کارنگی» بدە: (لەبەر ئەوەی کاریگەرو کردارییە، راستەوخۆ هێرش دەکاتە سەر ناوەڕۆکی گرفتو نیگەرانییەکان، قۆناغی جێبەجێ کردنی بڕیار کە کۆتا بەشی شیکارکردنو تەحلیلی نیگەرانییە دەبێتە هۆی زیادبوونی توانای هێرش بردن)·

ئێستە چاوەڕوانی چیت؟ ئیتر نیگەرانی بەسە بیربکەرەوەو بڕیارێکی دروست بدەو جێبەجێی بکە، ئەگەر دەتەوێت شاد بیت هەرکە نیگەران بوویت قەڵەمو کاغەزەکەت بهێنەو زۆر بە راشکاوانە وەڵامی ئەم چوار پرسیارە بدەرەوە:

١- بۆچی نیگەرانیت؟

٢- هۆی نیگەرانییەکەت چییەو چ بەڵگەیەکت هەیە بۆی؟

٣- بەڕای خۆت ڕێگە چارەی گونجاوی ئەم کێشەیە چییە؟

٤- لە نێوان ئەو ڕێگە چارانەی کە لەبەر دەستتان کامیان هەڵدەبژێریو بە شایستەی کارپێکردنی دەزانی؟

ئەگەر بۆ جارێکیش بێت هەوڵبدە ئەم ڕێگەیە تاقی بکەیتەوە·

سەرچاوە: کتێبی ئاوێنەکانی ژیان

هەڵبژاردنی/ ژوان کەمال·

هێمن ئەحمەد ڕەسوڵ

## مەحاڵە!

مەحاڵە ئەگەر کەسێك تۆی خۆشنەوێت، بچیتە ناو دڵییەوە·

مەحاڵە کۆیلەیەك بێت، لە کۆیلەیی ڕزگارت بکات·

مەحاڵە لە ژێر دەستی نەزانو نەخوێندەواردا، ببیت بە زانا·

مەحاڵە ئەگەر خەو نەچێتە چاوەکانت، بخەویت·

مەحاڵە لە ڕۆژێکدا دەوڵەمەند بیتو سەروەتو سامان بە دەست بێنیت·

مەحاڵە گریان گرفتەکانت چارەسەر بکات·

مەحاڵە کێوێك بێ ماندوبوون کون بکەیت·

مەحاڵە پیسی، پیسی لابەرێت·

مەحاڵە هەرچی بیستت ڕاست دەربچێت·

مەحاڵە ئەم خاڵانەی سەرەوە لە مەحاڵ دەرچنو جێبەجێ ببن·

عوسمانی حاجی سەلام

# بۆ گەیشتن بە دڵی هاوسەرەکەت

بۆ چێکردنی ژیانێکی بەختەوەر لە نێوان دووهاوسەردا پێویست بە شارەزاییو ئەزموون دەکات، بۆ بەدەست هێنانی ئەو شارەزاییەش پێویست بەگەڕان دەکات بە دوای زانیارییەکانی پێکەوەژیانی هاوسەرەکان، لەم بابەتەماندا (١٥) ڕێگەمان دەستنیشان کردووە بۆ ئەو ئافرەتانەی کە دەیانەوێ ڕێگەکانی دڵی هاوسەرەکەیان بدۆزنەوە، بە جێبەجێکردنی هەریەك لەو خاڵانەی خوارەوە بەشێکی خۆشەویستی هاوسەرەکەت بە دەستدێنی، بە جێبەجێکرنی سەرجەم ئەو خاڵانەش سەرجەمی دڵی هاوسەرەکەت یان بەشی هەرە زۆری بە دەستدێنی، ئافرەت بوونەوەرێکی بەهێزە، جێبەجێکردنی ئەو خاڵانەش لە دەرەوەی ئیرادەی ئافرەتدا نییە:

١- ئەو کاتەی پیاو لە دەرەوە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵ، پێویستە ئافرەت بە ڕوویەکی خۆشو پێکەنیناویەوە دەرگاکەی لێبکاتەوەو بە گەرمی سڵاوو پێشوازی گەڕانەوەی لێ بکات، هەروەك چۆن پێشوازی لە میوانێك دەکات، نواندنی ئەم کارە دەبێتە هۆی ڕەواندنەوەی ئەو ماندووبونەی لە دەرەوە تووشی بووە.

٢- ماڵ جێگەی حەوانەوەو ئارامکردنەوەی دەروونە، پاکڕاگرتنی بە زۆری ئەرکی ئافرەتە، جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە وا لە پیاو دەکات حەزی گەڕانەوەی بۆ لای هاوسەرەکەیو ماڵە پاکوخاوێنەکەی زیاتربێت، ئەو گەڕانەوەیەش خۆشەویستییەك ڕایدەکێشێ کە سەرچاوەی ئەو پاکوخاوێنیەیە کە ئەویش هاوسەرەکەیەتی.

٣- بۆئەوەی بە جوانی بێیتە بەرچاوی هاوسەرەکەتو سەرنجڕاکێش دەربکەوی، ئەوا پێویستە ڕای هاوسەرەکەت وەربگری لە هەڵبژاردنی ڕەنگو شێوازی جلو بەرگو داهێنانی پرچو..... هتد، (ئەمەش بەو شێوەیە نەبێت کە تەنها بەڕای هاوسەرەکەت بێو ڕای خۆت فەرامۆش بکەی)، بە ئەنجامدانی ئەم کارە سەرنجی هاوسەرەکەت ڕادەکێشیو دەیوروژێنی، چونکە هەموو پیاوێك حەز دەکات هاوسەرەکەی بە جوانترین شێوە ببینێت بەم جۆرە دڵو چاوی هاوسەرەکەت لە چوون بە لای ئافرەتی جواندا دەپارێزیت.

٤- پەروەردەکردنی منداڵ ئەرکی تەنها دایك یان باوك نییە، بەڵکو ئەرکی هەردووکیانە، بۆیە پێویستە ژنو مێرد بە بەرنامەڕێژیو پەروەردەیەکی تەندروست منداڵەکەیان پەروەردە بکەن، جا تۆی ئافرەتیش دایکێکی دڵسۆزبە بۆ منداڵەکانی خۆتو هاوسەرەکەت ئەمە لە لایەك، لە لایەکی ترەوە هەرگیز ڕوو لە هاوسەرەکەت وەرمەگێڕە بۆ منداڵەکەت بە تایبەت لە کاتی داواکاری منداڵ یان بوونی کێشەیەك، بەڵکو هەمیشە پشتی هاوسەرەکەت بگرە.

٥- بایەخدان بە منداڵ گرنگە بە مەرجێ لە بایەخی هاوسەرەکەت کەم نەکەیتەوە، واتە نابێت هەموو سۆزو خۆشەویستی خۆت بۆ منداڵەکەتبێو هاوسەرەکەت پشتگوێ بخەی، تۆ دایکی منداڵەکەتی نەك دایکی هاوسەرەکەت. سۆزو خۆشەویستی دان بە منداڵ جیاوازە لە سۆزو خۆشەویستی دان بە هاوسەر، پێویستە لە یەکیان جیابکەیتەوەو دایکانە لەگەڵ هاوسەرەکەتدا ڕەفتار نەکەی.

٦- بە کارهێنانی کۆمەڵێك وشە لە ژیانی ڕۆژانەدا دەبێتە هۆی زیادکردنی

ڕێزو خۆشەویستیو وەفا لە نێوان ژنومێرددا، لەو وشانەش (خۆشم دەوێی، سوپاس، ئازیزەکەم، گەر بە ئەرك نابێت، سڵاو خۆشەویستم، بە سەرچاو، بەخێربێیتەوە، .....هتد).

٧- تێرکردنی غەریزەی سێکسی ئامانجێکی گرنگی پێکەوەنانی ژیانی هاوسەرێتییە، ئەمەش پێویستی بە ئامادەباشییەکی دوولایەنە هەیە پێش کرداری جوتبوون.

٨- بە هۆی ئەوەی پیاو لە دەرەوەی ماڵو لە کارکردندا دووچاری ماندوو بوونو کێشەو گرفتو شکست دەبێت لە بەرامبەر ئەمەدا پێویستە ئافرەت ڕۆڵی دەروونناسێك بگێڕێت لە ئارامکردنەوەی دەروونی هاوسەرەکەیو ورەدانو هاندانی لەسەر کارکردنو گەڕاندنەوەی ئومێد بۆ ژیان، بەمەش پیاو هەست دەکات کە هاوسەرەکەی سەرچاوەی گەڕانەوەی شادییە بۆی، لە کاتی تووشبونی هاوسەرەکەت بە کێشەیەکەوە هاوخەمیو هاوئاهەنگی خۆتی بۆ دەربڕیو بە دوای ڕێگە چارەی کێشەکەیدا بگەڕێ بۆ ئەوەی بۆ هاوسەرەکەت دەربکەوێ کە لە کاتی ناخۆشیشدا تۆ هەر خۆشتدەوێو پشتگیری دەکەی.

٩- باری دارایی هاوسەرەکەتو ماڵەکەت لە کاتی کڕینی شتومەکی خۆتو ماڵەوەدا لە بەرچاوبگرە، چونکە ڕێزگرتن لە بەرهەمی کاری هاوسەرەکەت سەپاندنی دڵسۆزی تۆیە بۆ هاوسەرەکەتو ماندووبوونەکەی، ئەو کاتەی کە هاوسەرەکەت دەبینێ تۆ ڕێزی ماندووبوونەکەی دەگری هەست بە دڵسۆزی تۆ دەکات، ئەو کات هاوسەرەکەت زیاتر لەسەر کارکردن سووردەبێو هەست بە ماندوویی ناکات.

١٠- ئەرکێکی تری سەرشانی تۆی ئافرەت ڕێزگرتنە لە کەسو کاری هاوسەرەکەت، بە جۆرێ ڕەفتار بکە کە خۆت وەکو کەسێکی نێو ئەو خێزانەی، زۆری کێشەی نێوان بووکو خەسوو هۆکارەکەی هەستکردنی خەسووە بەزەوتکردنی کوڕەکەی لە لایەن بووکەکەیەوە، بەڵام گەر ئافرەت پاش شووکردنی نەبووە هۆی پچڕانی پەیوەندی نێوان هاوسەرەکەیو دایکەکەی ئەوە وێڕای ئەوەی کێشەی نێوان بووکو خەسوو ڕوونادات، بەڵکو دەبێتە هۆی بە دەستهێنانی ڕێزو خۆشەویستی هاوسەرەکەیو دایکیو کەسانی تریش.

١١- بە هۆی زۆر خۆشویستنی پیاو بۆ هاوسەرەکەی هەندێجار لە ترسی لە دەستدانی هاوسەرەکەی تووشی غیرەکردن دەبێتەوە، لێرەدا ڕۆڵی ئافرەت لە چارەسەرکردنی ئەو گرفتە دەروونییە بە دەردەکەوێ، ئەویش بەوەی تاماوەیەك بە گوێرەی دڵی مێردەکەی هەڵسوکەوت بکات تاوەکو لە ڕێگەی گفتوگۆوە بۆ هاوسەرەکەی ڕوون دەکاتەوە کە تەنها ئەوی خۆش دەوێو ئەویش هەموو کەسێکە لە دڵی ئەودا.

١٢- ئافرەت ڕووناکی ماڵەو سەرچاوەی بەختیارییە بۆ خۆیو هاوسەریو سەراپا خێزانەکەی، پێویستە لە سەرت ئەو کاتەی هاوسەرەکەت لە ماڵەوەیە هەوڵی خۆشحاڵ کردنی بدەی لە ڕێگەی دواندنو گاڵتە لەگەڵ کردنیو باسکردنی خۆشەویستی نێوانتانو بەرنامە ڕێژی بۆ داهاتوو نەك زۆربەی کاتەکانی پێکەوە بوونتان بە داواکاریو بۆڵەبۆڵو شەڕوئاژاوە بەرنەسەر، چونکە دەبێتە هۆی وەڕسکردنی مێرد لە ماڵ کە ئەمەش دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی خۆشەویستی نێوانتان.

١٣- مێشکی ئافرەت توانایەکی باشی هەیە لە پەیبردن بە شتە ئاڵۆزەکانو بە هێزکردنی پەیوەندی هەر بەم هۆیەشەوە ئافرەت دەتوانێت سەرجەم ئەو ڕێگایانە بدۆزێتەوە کە دەبنە هۆی خۆشەویست کردنی لای هاوسەرەکەی، هەر ئافرەتیشە بە زۆری دەتوانێ پەیوەندی کۆمەڵایەتیو خزمایەتیو دراوسێیەتی...هتد دابهێنێ، هەر بۆیە بە گەڕخستنی تواناکانی مێشك بە دوای فاکتەرەکانی سەرکەوتندا خۆی لە خۆیدا بە دەستهێنانی سەرکەوتنە لە ژیانی هاوسەرێتیدا.

١٤- لە کاتی نەخۆشکەوتنی هاوسەرەکەتدا تۆ دەتوانی ڕۆڵی پزیشکێك بگێڕیت لە چاکبوونەوەی، ئەویش لە ڕێگەی یارمەتیدانو خزمەتکردنییەوە.

١٥- هەوڵ بدە لە زۆربەی کارە هاوبەشەکاندا ڕای هاوسەرەکەت وەربگری بۆئەوەی ئەو کارەی کە ئەنجامی دەدەن بە دڵی هەموو لایەکتان بێت هەر لە سادەترین کارەوە تا دەگاتە ئاڵۆزترینیان بۆنموونە: (چێشت لێنان، کڕینی کەلو پەلی ماڵ، پۆشینی جلو بەرگ، دەرچوون بۆ شوێنی گەشتوگوزارو میوانداریو بازاڕو.....هتد).

لە پێناو نەهێشتنی ئەو گلەییو گازندانەی کە هاوسەرەکەت لە تۆ دەیکات هەستە بە ئەنجامدانی بەراوردێك لە نێوان ئەو خاڵانەو کارەکانی خۆت بزانە تا چەند درێغیت لێکردوون؟ بەڕاستکردنەوەیان ڕەزامەندیو خۆشەویستی هاوسەرەکەت بەدەست دەهێنیت.

# ژیان فێری کردم!

و. ئالانی

**فێربووم کە:** پێویستە مرۆڤ خەون بە ئەستێرەکانەوە ببینێ، بەڵام دەبێت قاچەکانی لەسەر زەوی بمێنێتەوە.

**فێربووم کە:** مرۆڤ بەبێ ئارامگرتن، وەکو ئۆتۆمبێل وایە بەبێ بەنزین!

**فێربووم کە:** ناوبانگی باش ئەو سەروەتە گەورەو بە نرخەیە، کە پێویستە هەمیشە پارێزگاری لێ بکرێت.

**فێربووم کە:** کاتێك مرۆڤ دەیەوێت دەوروبەرەکەی بگۆڕێت، پێویستە سەرەتا خۆی بگۆڕێت.

**فێربووم کە:** گەورەترین هەڵە کە مرۆڤ تێی دەکەوێت، ئەوەیە کە خۆی بە هەڵە نازانێت.

**فێربووم کە:** بەبێ ڕەزامەندی خۆمان، هیچ کەس ناتوانێت هەستمان بریندار بکات.

**فێربووم کە:** کاتێك مرۆڤ بیرۆکەیەك دەچێنێت، کارێك دەدورێتەوە، ئەگەر نەریتێك بچێنێ، هەڵسوکەوتێك دەدورێتەوە، ئەگەر هەڵسوکەوتێك بچێنێت، ڕێزو خۆشەویستی دەدورێتەوە.

**فێربووم کە:** کاتێك مرۆڤ تووشی گرفتێك دەبێت، پێویستە هەرگیز نەڵێت: (گرفتێکی سەختە)، چونکە ئەگەر سەخت نەبێت، پێی ناوترێت (گرفت).

پێش ماڵئاوایی

شێخانی

# لە بڕیارەوە چی فێر بوویت؟

ئەو کاتە زانیم کە بڕیار چەندە کاریگەری خۆی هەیەو ڕۆڵی خۆی بینیووە کاتێك لە چەندین خوێنەری بڕیارم پرسی: لە بڕیارەوە چی فێر بوویت؟

لە وەڵامدا گوتیان: بڕیار فێری کردین کە ببینە خاوەنی بڕیاری خۆمان.

بە بیستنی ئەم وەڵامە هەستم بە شادییەکی زۆر کرد، دڵخۆشبووم کە بڕیار وەها کاریگەرییەکی هەبێت لەسەر ناخی خوێنەرەکانی.

هەندێك لە خوێنەران بە هەستکردن بە سەرکەوتنەوە دەیانگوت: پێش ئەوەی ببینە خوێنەری بڕیار، کەسانێکی بێبەرنامەو لاموبالاتو بێ ئامانج بووین، وەلێ ئەمڕۆ مرۆڤێکی ترین..

دەیانگوت: پێشتر هیچ گرنگییەکمان بە کاتەکانمان نەدەدا، بەرنامەمان نەبوو بۆ خوێندنەوە، بۆ داهێنان، هیچ پرۆژەیەکمان نەبوو، بەڵام دوای ئاشنابوونمان بە بڕیار، ئێستا ژیانێکی تر بەسەر دەبەین!

خوێنەرێکی دیکەی بڕیار گوتی: بڕیار لە ماوەی دوو ساڵی تەمەنیدا فێری هونەری ژیانێکی بەختەوەری کردین، فێری بڕیاردانێکی سەرکەوتووانەی کردین، فێری کردین سەرکردەیەکی دڵسۆزو کارامەبین، باوکێکی هێمنو هاوڕێی منداڵەکانمان بین، دایکێکی میهرەبان بینو بە پرۆگرامێکی نایاب منداڵەکانمان پەروەردە بکەین، منداڵێکی دڵسۆزو بە ئەمەك بین، فێری هونەری هاوڕێیەتیو پەیوەندی کۆمەڵایەتی کردین، بەڕێوەبەرێکی لێهاتوو خۆشەویست بین، کارمەندێکی خەمخۆری کاتو کار بین، مامۆستایەکی داناو بە پەرۆش بین بۆ خوێندکارەکانمان، خوێندکارێکی زانستخوازو خۆشەویستی مامۆستا بین، فێری کردین هەرکەسێك جۆرێك مامەڵەی دەوێت، هەر سەردەمەو پەروەردەو پرۆگرامی خۆی هەیە، هەر ساتە کاری خۆی هەیە، هەر چرکەو نرخی خۆی هەیە، فێری کردین خامەمان لە چیدا بەکاربهێنین.

خوێنەران لە ناخی دڵیانەوە سوپاسی ئەو بیرەجوانەیان کرد کە بڕیاری بڕیاریاندا، ئەو خامە ژیرانەی خەمی ژیاری خەڵکییانە، وێڕای ئەوەی خوێنەران پێیان وایە هێشتا بڕیار تەنها گوڵێکی لە گوڵدانی داهێنانو پێشکەوتن... پێشکەش کردووەو چاوەڕوانی زیاترن.

لەگەڵ هەموو وتەیەك لەم وتە ناسکانەدا هەست بە شادمانییەکی بێ سنوور دەکەم.

سوپاس بۆ پەروەردگار، ڕەنجو ماندووبوونی بڕیار بەرهەمی گەورەی هەبووەو بڕیار ئامانجی خۆی پێکاوەو خۆشەویستانی بڕیاریش لە پەیامەکەی تێگەیشتوون.

هەرسەرکەوتووبن.